
تۆخەی گردەکەی یارە
چەند شیرین و نازدارە
ئەو کاریزەی لەبەر پێی
ئاوی شیرینی شارە، ...
بۆیە هێندە جوانی
جێی نەورۆزی کوردانی
سەیرانگای بەهارانی
جێی ئومێدی لاوانی، ...

# حاجی باقی بەنگینە

## "شاعیری گەل"

## شاعیری میللی و کوردپەروەر

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

**عوسمان محەممەد هەورامی**

**دووەمین چاپ**

**سلێمانی ( ٢٠١٦)**

ناوی کتێب: دیوانی بەنگینە (حاجی باقی بەنگینە)

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: عوسمان محەممەد هەورامی

تایپ و دیزاینی ناوەوەو بەرگ: ئەمیرە عومەر

هەڵەبڕی: نووسەر

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپ: چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (١٦٥٥) ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە

# پێرست

## بەر لە پێشەکی

# "ئامادەکردنی ئەم دیوانە"

لەپاییزی (١٩٧٩) دا، بۆ ماوەی سێ مانگ، بەردەوام خەریکی گەشتی ژمارەکانی ژیان، ژین، گۆڤاری گەلاوێژو هەتاو بووم. لەئەنجامدا لەتوێی دوو دەفتەری سەد پەڕەییدا چەندەها دەق و هۆنراوەم تۆمارکرد، هۆنراوەکانی (حاجی باقی بەنگینە)ش بەشێکی زۆریان گرتەوە. بەداخەوە ئامادەکردنی دیوانەکەی زۆر دواکەوت. لەهاوینی (١٩٨٤)دا، لەگەڵ کاکە (نوری بەنگینە)دا ـ کوڕی شاعیر، باسی کۆکردنەوەی دیوانەکەی باوکیم کرد، گەلێك پێیخۆشبوو... لەسەرەتای (١٩٨٥)دا، بەپۆزشی زۆرەوە ئاگاداریکردم کە مامۆستا (مەحموود ئەحمەد محەممەد) ـ ئەمینداری کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی ـ ئەو ئەرکە ڕادەپەڕێنێ. منیش زۆر پێمباشبوو، لەناخەوە دەربارەی دیوانی (بەنگینە)ش دڵنیابووم. لەناوەڕاستی مانگی ئابی (١٩٨٦)دا، کاك نووری ئاگاداریکردم کە مامۆستا (مەحموود) لەبەر سەرقاڵیو جەنجاڵی، دەستی لەپڕۆژەی تەواوکردنی کۆکردنەوەو ئامادەکردنی دیوانەکەی بۆ چاپ هەڵگرتووە. لەهەمانکاتدا تکای لێکردم دیوانەکە ئامادەبکەمو بنەماڵەش لەچاپیدەدات. منیش دووبارە ماوەی دوو ساڵ سەرگەرمی کۆکردنەوەو ئامادەکردنی بووم، بەو ئاواتەی گوڵێکم خستبێتە سەر خەرمانی وشەی گەشو ڕەسەنی کوردیو ڕەوانی (حاجی باقی بەنگینە)ی ڕەنجدەرو چەوساوەم شاد کردبێ.

بۆ بەدیهێنانی ئەم بەرهەمەش، بەڕێوەبەرو کارمەندانی کتێبخانەی گشتیی سلێمانی، کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیو کتێبخانەی مۆزەخانەی سلێمانی بۆ

ماوەیــەکی دوورو درێــژ میوانــدارییانکردوومو ئــەرکی زۆرم خســتۆتە ســەریان.
مامۆستایانی بەڕێزیش (کەریم زەند، مەلا عەلی سەنجەری، عەبدولقادری دەباغیو
مەلا عەلی محەممەد ڕۆستەمی حەسەنکەنۆشی)، بەگوێرەی شارەزاییان، ناوی گەلێ
شوێنو گوندو شاخیان بۆ ڕوونکردومەتەوە، سوپاسو پێزانینم بۆ هەموویان.

# پێشەکی

بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی لای کاك نووری بەنگینەی کوڕی پارێزراون، ئەم شاعیرەمان، ناوی (فەیضوڵڵا باقر ئەحمەد) ە، ساڵی (١٩٠٨) لە شاری (سەقز) لەدایکبووە، لەبەر دژواریی بارودۆخی ژیانو بژێویی زۆر سەخت، لە گەرمەگوڕی تەمەنیدا ڕوویکردووەتە شاری (سلێمانی)و تێیدا نیشتەجێبووە. تا لە (١٥ ـ ٩ ـ ١٩٧٢)دا، بۆ هەتا هەتا بووەتە میوانی گردی سەیوانی پیرۆز.

ئەم شاعیرەمان بە درێژایی تەمەنی، هەرگیز بەناوی خۆیەوە، نە بانگکراوەو نەناسراوە، بەڵکو هەر بە (حاجی باقی)، یان (بەنگینە) ناسراوە.

جا چۆنو لەبەرچی ئەم ناوەی گۆڕدراوە؟!: لەرۆژنامەی ـ بیری نوێ ـ دا، ژمارە (١٩٠) ڕۆژی ٨-٢-١٩٧٦ ـ مامۆستا ڕەئووف زوهدی، لە وتارێکیا، بەسەرباسی (بەنگینە)، بەمچەشنە وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە:

شاعیرو ڕۆژنامەنووسی کورد، پیرەمێرد، (بەنگینە)ی ناو نابوو (حاجی باقی)، ئەم ناوی حاجی باقی ـ یەی لەوەوە لێنراوە، لە چیرۆکێکی شانۆییدا کە (بەنگینە) تیایدا ئەکتەر بووە، ناوی (حاجی باقی) بووە، ئیتر لەوساوە ناوەکەی خۆی (فەیضوڵڵا) لەبیرکراوەو، بە (حاجی باقی)، وە یا (بەنگینە)، کە نازناویەتی، ناسراوە...

ئەوەندەی منیش بیستوومەو ئاگادارم، لە سەردەمی پیرەمێردی نەمردا، چەند جارێ شانۆگەریی مەمو زین کراوەو، فەیضوڵڵا، یا با بڵێین ــ حاجی باقی ــ دەوری (بەنگینە)ـ ی پێسپێردراوە لەبەرئەوەی زۆر بە باشی ڕۆڵەکەی گێڕاوە پیرەمێرد هەر بەو ناوەوە بانگیکردووە، شایانی وتنیشە، کە هەر بەو ناوەشەوە هۆنراوەی بۆ بڵاوکردووەتەوەو، بەتەواوەتیش ئەو ناوە نوێیەی جێی ناوەکەی بەڵگەنامەی باری

شارستانیی گرتووەتەوە، بووەتە پێناسەی‌و گەلێك شانازیشی پێوەکردووە. مامۆستا ـ محەممەد ساڵح دیلان ـ ی شاعیریش، کە لە نزیکەوە ئاگاداری ژیانی ئەم شاعیرەمانە، بۆی گێڕامەوە، کە (بەنگینە)، گەلێ پێیخۆشبووە بەم ناوەوە بانگکراوەو ناسراوە، بگرە زۆر شانازیشی پێوەکردووە...

ئەم شاعیرەمان تا دوا هەناسەی ژیانی هاوشانی کاروانی شیرینی‌و تاڵیی گەلی کوردی قارەمان بووە...

بۆ ئەوەی پتر لە ژیانی ئەم شاعیرە میللییە بلیمەتەمان ئاگاداربین، تکام لە کوڕە گەورەکەی کرد کە ناوی (نووری بەنگینەیە)و لە (١٩٢٧) دا، لە دایکبووە، دەربارەی باوکی هەندێ بیرەوەریمان بۆ تۆمار بکات، کاکی ناوبراو، وتی:

کە گەیشتمە تەمەنێك هەست بە خۆشی‌و ناخۆشیی ژیان بکەم، باوکم ـ (حاجی باقی بەنگینە)م بەهەژاری‌و نەبوونی دیوە ...

یەکەم جار باوکمم دی لە کانیی ئاسکانەوە بە ولاّخ ئاوی ئەهێنا بۆ ناو شار، بۆ هەندێ دامودەزگای دەوڵەت‌و ماڵان .. من هەرچەندە منداڵبووم‌و نەمئەتوانی یارمەتییبدەم، بەلاّم ڕۆژی چەند جارێ لەگەڵیا ئەچووم بۆ کانیی ئاسکان...

دوای ئەوە بوو بە نانەواو چەند ساڵێ بەو جۆرە ئێمەی بەخێو کرد، کاتێ کە مامم مرد، باوکم چووە سەر چایخانەکەی، لە ئەسحابەسپی ... بەمچەشنە (بەنگینە)، تا کۆتایی ژیانی کاری هەر چایچییەتی بوو.

(بەنگینە)، سەرەڕای هەژاری‌و نەداری، گەلێ دڵ‌و دەروونی دەوڵەمەندو بەرزبوون... هەمیشەو هەردەم ڕووخۆش‌و خۆشدوو بوو، خاوەن ورەیەکی زۆر بالاّ بوو.

پاشان کاك نووری گوتی:

لە یادمە، کە شاگرد نانەوا بوو، هەر کە دەستی هەڵئەگرت، دەفتەرەکانی، کە لە هەمانئانەواخانەدا بوون، هەڵئەگرتن‌و یەکسەر ئەچوو بۆ قوتابخانەی زانستی، بەمچەشنە تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە زانستی تەواوکرد، ئێوارانی هەموو پێنجشەممەیەك، لە قوتابخانەی زانستی کۆڕی شیعر خوێندنەوە ساز ئەکراو، پیرەمێردی نەمر سەرپەرشتیئەکرد، زۆربەی جاریش (بەنگینە) بەشداریئەکرد.

ئەوەندە پەیوەندیی لەگەڵ پیرەمێـردا پتـەوبوو، وای لێهات پیرەمێـرد ئاهەنگی ساڵانەی نـەورۆزی بـە بەنگینـە ئەسـپارد... ئـەمیش زۆر چـالاکانە بـەر لـە هـەموو نـەورۆزێ، چـەندان بـارەداری ئـەکڕین‌و، کۆمـای لێـژەداری لەسـەر گـردی مامـەیارە هەڵئەدایەوەو، بۆ ئێوارەی نەورۆز، لەگەڵ چـەند کەسێکدا، کڵپـەی نـەورۆزیان بـەرز ئەکردەوە... لە دواییدا بەسرووودی ئەوسـای نـەورۆزەوە، بـەرەو (قەلەندەرخانەکـەی پیرەمێـــرد) ئەکشـــان، پیرەمێـــردیش پێشـــوازیی لێئـــەکردن‌و، ماوەیـــەکیش سەرچۆپییەکەی بۆ ئەگرتن...

لەسەرە مەرگی پیرەمێردیشا، لەگەڵ باوکم‌و چەند کەسێکی تـردا، لەسـەر سـەری بووین، باوکم شیوەن‌و چەمەرییەکی وای بۆ گێڕا، بەردی ئەکرد بە ئاو...

چەندان جاریش کە لەپچەم لە دەست‌و مەچەکی بەنگینەدا دیوە...

بەڕاسـتی تێکـڕا هـەمووان‌و بەتایبـەتی لاوان، گەلـێ خۆشیانئەویسـت‌و ڕێزیـان لێئەگرت..

# "ڕێبازی هۆنراوەی بەنگینە"

شاعیری میللی یەکسەرو، یەکەوڕاستو ڕووبەڕوو، بەزمانی زوربەی گەل ئەدوێو، لەدڵو دەروونیانەوە زۆر نزیکە، زمانو لێکدانەوەو ئاستی ڕۆشنبیریی، وێنەکێشانی ڕووداوەکانو بۆچوونی بۆ بابەتی کێشە جۆراوجۆرەکان، هەموویان ئەباتە ڕیزی پلەی ئەوانو ، بەتەواوی، بێپێچو پەنا تێئەگەنو، ئاگاداری مەبەستو ناوەڕۆکی شیعری شاعیرن، چونکە، ئەو بۆ خودی خۆی نانووسێ ـ بۆ جەماوەر ئەنووسێ.

هەر بەم پێودانگە، (بەنگینە)ی شاعیریش یەکێکە لەو شاعیرە میللییانەی لە نزیکەوە بە هەستو ئاواتی جەماوەری گەلەکەمان ئاشنابووەو، بێیەكو دوو، یەکسەر چووەتە دڵەوەو، بەتەواوی جێی خۆی کردووەتەوە... هەر لەبەرئەمەشبووە لەساڵی (١٩٥٠ )ەوە، بە(شاعیری گەل) ناسراوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەوە هاتۆتە کایەوە، کە شاعیرمان لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیا، ڕاستەوخۆ، خۆی بەستووەتەوە بە ئاواتە مەزنەکانی ڕۆڵە چەوساوەکانی گەلەکەیەوەو، لە هەموو هەڵوێستە نەمرەکانیشیا بە دڵنیاییەوە ئەمەی سەلماندووە، بۆیە گومانی تیا نییە، کە (بەنگینە) شاعیرێکی نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕ بووەو، ڕێبازی ریالیزمی گرتۆتەبەرو، لەسەراپای هۆنراوەکانیا ئاواتی ڕەوای نەتەوەکەی دەربڕیوە.

ئەوەش لەیادنەکەین کە ئەم شاعیرەمان سەر بەهەمان قوتابخانەو ڕێبازی هۆنراوەی شاعیرە بەرزە میللییەکانی سەردەمی خۆیەتی، لەوانەش، بۆ نموونە، مامۆستا قانعو مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای موفتیی پێنجوێن. لەو هۆنراوانەدا کە بۆ ئەوانی نووسیوون، ئەم ڕاستییە چاك دیارە.

# "بەنگینەو پیرەمێرد"

وەکو بۆمان ڕوونبووەوە، (بەنگینە) گەلێ هۆگری پیرەمێردی لوتکەبووەو، پەروانە ئاسا بەدەوریا گەڕاوەو لێی دوورنەکەوتووەتەوە... نموونەی بالاو پێشەنگی (بەنگینە)ش بەتەنیاو، تەنیا هەر پیرەمێردی نەمر بووە... لە هەمانکاتیشا (بەنگینە) یەکێکە لە دەستەمامەکانو بەرهەمی پیرەمێردی مەزن، کە وەکو قوتابیو شاگردێکی زۆر پێزانو بەئەمەك، هەمیشەو هەردەم ئەمەی لەبەرچاو بووە:

شاگردی پیرم، حاجی بەنگینە

بولبولی زانست، پەروانەی ژینە

لەهەمانکاتیشا، لەکانگەی دڵیەوە ئەوپەڕی ئاواتی سەرفرازیی بۆ خواستووە لەپێناو خزمەتی گەلی کوردا:

یاخوا هەر بژی پیرەمێردی کورد

لەڕێی خزمەتی کورد بەدەستوبرد

شاعیرمان، ئاگاداری ڕۆڵی گەورەی پیرەمێرد بووە بۆ نووسینو تۆمارکردنو پاراستنی ئەدەبو مێژووی دێرینی گەلەکەمان، زۆرتریش تکای لێکردووە کە لەم ڕووەوە زۆرتر هەوڵمان بۆ بدات، جار هەیە بە (پیر) ـ واتە داناو ژیر و دانشمەند ـ ناویبردووە.

پیری دڵسۆزی چرای کوردستان

زیندووکەرەوەی ئاساری کوردان

جارێکی کەش وەکو باوکی ڕەوانیو گیانی بانگیکردووە:

**بۆ بـــاوکی دڵسۆز پیرەمێردی کورد**
**قـــــەڵەمت لەچاو نەزانی توند کـرد**

جـارێکیش لەسـەرزاری خوشکەزاکانی پیرەمێـردو کـەسو خزمـانو دانیشـتووانی شاری سلێمانی بە وشەی ـ خاڵە پەنای بۆ بردووە:

**خاڵە پیرەمێرد، خــاوەند ژینو ژیان**
**مـێژوونووســـــەکەی وڵاتی کـوردان**
**خـــــاڵە فـیداتبم، باخـــەوانی ژیـن**
**پەیجـۆری ئاداب، پێشـــــەوای ئایین**
**خــاڵە پیرەمـێرد، باخــــەوانی ژین**
**ســەروەری زانست، بۆ وەتەن پەرژین**

بەمچەشنەو، بەشێوەیەکی زۆر ناسكو، بەزمانی هەمووانەوە تکای لێکردووە:

**تەئریخی کــۆنمـــان بـۆ بدۆزەرەوە**
**بەفــەنو خــــوێندن سەرمانخەرەوە**

لێرەدا، تا ڕادەیەك وێنەی ئـەو خۆشەویستیو ڕێـزە باڵایـەمان بـۆ دەرکـەوت کـە (بەنگینـە)ی شـاگردو قوتـابیی پیرەمێـرد، بەرانبـەر بـە مامۆسـتای بـەرزو بـەنرخو هێزای هەیبووە. پیرۆزبایی لەپەیوەندیی گیانی بەگیانیی میانەی مامۆستاو قوتابیی بە ئەمەك ...

## "بەنگینەو قوتابخانەی زانستی"

هەر لەو ساتەوە شاعیرمان پێیناوەتە قوتابخانەی زانستی، ئیتر هەموو هۆش‌و هەستی داوەتە خوێندن، ... بەڕاستی لەجێی خۆیایەتی شەیداناسا شەیدایی‌و خۆشەویستی‌و، تاسەی پڕ لەگڕی خۆی بەرانبەر بەم مەڵبەندە ڕۆشنە دەربڕیوەو گەلێ شانازیی پێوەکردووە:

من کە لاوێکبووم، ئەووەڵ هیچ نەزان
بەخوێندنی زانست هاتوومە مەیدان

چاکیش زانیویەتی کە بۆچی هاتووەو، ئامانجیش لە خوێندن‌و زانست، لایەنە ڕۆشنەکانی ژیانن‌و، ئەم ڕێبازەش دوورە لە تاریکی‌و گومڕایی‌و لادان:

نەك بۆ مەیدانی مەشرووب‌و قومار،
بەهۆی عیلمەوە، بۆ قسەی ئاودار

هەر لەم ڕوانگە ڕاست‌و ڕەوانەوە، ڕوویکردووەتە لێپرسراوانی ئەو سەردەمە، کە بەرانبەر بە زانست کەمتەرخەمییانکردووە، هەروەها ئەوانەشی گرتووەتەوە، کە بەرهەڵستیی زانستییان کردووە، ڕاستەوخۆ پێیگوتوون:

قەدری زانستی بۆچی نازانن!!
بەزانستەوە ئێوە ئینسانن!

شاعیرمان قوتابخانـەی زانستیی بردووەتـە ڕیـزی بەهەشـت، کـە بۆچوونەکەشـی ڕاستو دروستەو، تکاشی لە کورد کردووە هەر بەوچاوە سەیریبکەن:

مەکـــتەب بۆ ئێوە پێویستە کوردان
ئـەبێ پێیبڵێن بەهـــەشـتی جـــیهان

بـەجۆرێ ئەشـقو ئـەوینی زانسـت لـەناخی شـاعیرمانا ڕەگـی داکوتـاوە، تەنانـەت (شیرینی ئەرمەن)، بەو هەموو شۆخیو نازداریو شەنگییەوە، کردووە بەسـەرگەردی نازدارە ڕاستەقینەکەی خۆی، قوتابخانەی زانستی:

هەزار شۆخو شەنگ، شیرینی ئەرمەن
بیکـــە بە قـــوربان زانســـتیی وەتـەن

بەڵێ، ئەم شاعیرەمان پەروانەئاسا، هەمیشە لە دەوری چرای زانستیدابووەو ، بـە دیار شەوقو ڕۆشناییو تینی نازداری ڕاستەقینـەیەوە، بەهرەی نەمری وەرگرتووە،...

بەنگینەش لـــەبەر چـــرای زانســـتی
شـــاعیریی کـــردووە بە گوڵی دەستی

لـەو سەردەمەشـا، کـە قوتابخانــەی زانسـتی، بێخزمـەتبووەو هـیچ لایـەك بـۆی نەپرسیوەتەوە، بە هەناسەی ساردو قووڵەوە داخی دڵی خۆی دەربڕیوە:

زانست ناگـــونجێ لـــە یانەی چۆڵدا
حـــەیفە ئەســـیر بێ لـــە خاكو خۆڵدا

بەمچەشـنە جەسـتەی قوتابییـانو مامۆسـتایانی قوتابخانـەی زانسـتی خسـتووەتە پاڵ بارودۆخی کونەبەبووی کەلاوەنشین:

ئێمەو بایەقوش، هەردوو هاودەردین
کـــەلاوەنشین، هەناســـە ســـــــەردین

کەمتر دڵدار هەڵکەوتووە، بە وێنەی (بەنگینە) هۆش‌و یادی لای نازدارەکەی بن، لەڕاستیدا بەهەموو مامۆستایان‌و قوتابییان‌و شەیدایان‌و نووسەران‌و شاعیرانی قوتابخانەی زانستی، نەیانتوانیوە هێندەی (بەنگینە)ی شاعیر زانستییان خۆشبوێ‌و، بە باڵای بێوێنەیا هەڵبدەن، لە سنوور بەدەرو، بێپشوودان، هەر شەیدابن‌و ئەم سۆزە خاوێنە تاسەر ببەنە سەر:

**یا بە بادەی کەیف، بەنگینەی باقی**

**لە خۆشیی زانست بووە بە ساقی**

سەرەنجام شاعیرمان بەشێوەیەکی زۆر بڵندو بەرز، ئەمەك‌و خۆشەویستیی خۆی بەرانبەر بەو ئەشقەی کە هەمیشە سەریکردووە، دەربڕیوە:

**شەرتە تا ماوم، زانستیی کوردان**

**ناچی لە یادم، بەزاتی یەزدان**

شادی، نەمری، شانازی‌و بەختەوەری بۆ ئەشقی گەورەو دروست‌و بێگەردو نەمر...

# "هەڵوێستی نیشتمانیی شاعیرمان"

ئـەوە بـوو ڕژێمـی دەرەبـەگیو پاشـایەتیی بـەناو دەسـتووری، بـە چـاودێریی ئیمپریالیزمی بابە گەورەیان، بەجۆرێ کەوتە چەوساندنەوەی سەراپا گەلانی ئێراق، تـاوای لێهـات بەتـەواوەتی دەسـتینایە بیناقاقـای هـەموو ئـەو گەلـە نەبەزانـە ... هـەمووان، بـە کـوردو عـەرەبو کەمایەتییـەکانی دیکـەوە، لـەڕووی زۆردارا بوونـە بورکانی هەمیشە هەڵچووی درێژەدار...

بێگومـان شاعیریشـمان لـەڕیزی پێشـی پێشـەوەدا بـووەو، لەهـەموو ڕاپـەڕینو خۆپیشاندانێکا نرکەو ناڵەی (بەنگینە) ئەوەندەی تر گڕی بەرداوەتـە گیـانو بـوونی جـەماوەری شـاری کوردایـەتیو ڕاپـەڕینو قوربـانی... خـۆ ئەگـەر ڕۆژگـار تۆمـاری هەبوایـە، تـاکو ئێسـتاو لەمـەودواش، لـە شـەقامو کۆڵانو گەڕەکـەکانی سـلێمانی، لـە گوێـژەو گڵـەزەردەو پیرەمەگروونــەوە، گوێمـان لـە نـەڕەو دەنگدانـەوەی دلێرانـەو شێرانەی (بەنگینە) ئـەبوو... هـەر لـە یەکـەم هـەنگاوەوە، بلیمەتانـە ڕێگای ڕاسـتو ڕەوان، ڕێـی قەڵـەم و ڕۆشـنبیری، گـەڕان بـە دوای نـەژادو مێـژووی بێگـەرداو، کەلکلێوەرگرتنی، ڕەچاوکردوونو هاواریکردووە، کە هەمووان:

دەرسـی تـەئریخی کورد بکەنە بەر
قـەڵەم هەڵگرن، لەجیاتی خـەنجەر

شـاعیرمان هەمیشـە لـە سـەنگەری چەوسـاوەو بەشـخوراوو، کرێکـارو جووتیـارو پاڵەکانا بووە، دەنگی، دەنگی ئەوانەو جیابوونەوەیان نییە:

مـن تووتن بکـەم، بـەدڵ و بەگـیان
بۆ دۆنمەکان بەن، بە ئاغاو بە خان؟!

لەهەڵوێستێکی تریشیا، بەشێوەیەکی جوانو بەڵگەی چەسپاوەوە، وەڵامـی زۆر بـەجێو شیاوی ئـەو خـۆ گێلکەرانـەی داوەتـەوە، کـە زۆر نـاڕەوا ئـەڵێن خـوا ئاغـاو پارەدارانی دەوڵەمەند کردوونو، پێڕەواو پێشیاون:

**لــە کام ئایەتا فــەرموویە یــەزدان**

**لــە ژین بێبەشبێ هــەژاری جیهان!!**

پـاش ئـەوەی لـە سـەردەمی لاویو هەرزەکاریـدا، هەنـدێ هـۆنراوەی دڵـداری لـە کانگـای دەروونـی بەکوڵـیـەوە سـەریانهەڵداوە، لـەپڕ گوژمـە تەزوویـەکی بـەگوڕ، بـە هـەموو بوونـیا گـوزەریکردووەو، لـە نـووکی خامەکەیـەوە، بـەم چەشـنەی خـوارەوە، وزەوتینـی دەرکەوتووە:

**بەنگینە بەسیە وەسفی چاوی جوان**

**وەرگــەڕێڕە ســەر مەدحی نیشـتمان**

بەمچەشنە بووەتە مەیگێڕی، کۆڕی زاناو هوشیارەکانی ڕێی نیشتمانی سەرکەشو پیرۆزو شیرین، بووەتە ساقییەکی هوشیارو داناو، دڵ پڕ لە کڵپەی ئەشقی ڕاست:

**بەڵام کام ساقی! .. بادەی (عیلم) نۆش**

**بــۆ وەتــەن دایــم دڵــی بێتە جـۆش**

لەکاتی ڕاپەڕینە مێژوویـیـەکەی ساڵی (١٩٤٨) دا کە سەراپا هەموو بستێکی ئێراقی گرتووەتــەوە، دووربینانــە هاتووەتــەگۆو، مــژدەی ئــازادیخوازانی، بــە هــەموو دڵو هەستێکی گەش گەیاندووەو، ڕوویکردووەتە ڕووباری دیجلەی فراوان:

**دیجـلە پێبکــەنە لــەباتی گــــریان**

**تێکــەڵبوو بـە تۆ خـوێنی شــەهیدان**

**ئــەو خــوێنە گـەشە تۆو دێنێتە بەر**

ڕیشـــەی ئیستیعمار لـەبن دێتە دەر
دیجلە، بجۆشــە، مــەڵێ مــاتەمە
مـژدەبێ لـــــەتۆ، ئاخــری خـەمە!!

لە ئـەنجامی ئـەو ڕاپەڕینـە بەرینـەدا، بەنگینـەش وەکو هـەزاران دڵسۆز، بەنـدی زیندانی تەنگو تارو دوورە دەنـگ کراوە ... دوای بـەربوونو دەرچوون لـە زینـدان، هەندێ لە خزمان تکایان لێکردووە، کە دەسبەرداری ئـەو ڕێبـازەی بـێ، چونکە تـازە تەمەنی ڕوو لە هەورازەو، تواناو تینی نەماوە!! ... (بەنگینە)ش بەزەردەخەنەیـەکی پڕ لە باوەڕەوە بەمچەشنە پەیامی تێکۆشانی گەیاندووە:

چەند خۆشە پیر بی و خوێنت گەرمبێ
وەتـەنفرۆشـتن لـــەلات شــــەرمبێ
بۆ خــــەباتکــردن ژیرو چــالاکــبی
لـــــەناو لاوانا دیـــارو تاکــــــبی
قەت مل کەچناکەم لەڕووی دوشمنان
هـــەتاکــو ئەچـمە ڕیزی شـــەهیدان

لـەبواری ڕەخنـەی بێگـەردو ڕاسـتو ڕەوانیشـا، زۆر وریایانـە، بەرپەرچـی تاکـە هۆنراوەیەکی مامۆستا قانعی داوەتەوە، کە لەکاتی خۆیاو لەساڵی (١٩٤٢)دا، لـە گۆڤـای گەلاوێژدا بڵاویکردۆتەوە، بەڵێ (بەنگینە) بەشێوەیەکی جوان گوتوویەتی:

مـــــەڵێ لایـــلایە، کـــوتەك بخــەوە
بڵـــــێ ڕاچـــەنە، کـوتەك مەسرەوە

# "بەنگینەو ئاشتی"

ئەوە بوو، بە کڵپەو شالاوی ئاگرە سوورەی لەڕادەبەدەری، دووەمین جەنگی سەرمایەداران‌و زۆرداران‌و دەسەڵاتدارانی جیهان، کە زۆر بە نارەوایی ناوی لێنراوە دووەمین جەنگی جیهانی، ئەوەندەی تر ئەم سەرزەمینە پان‌و بەرینە، بەجۆرێ هەڵقرچا، هەرگیزاو هەرگیز لەیاد ناچێ‌و، کارێکی واکرا، کە تۆماری یەکەمین جەنگی جیهانی هەماندەستەی داکرد... تۆماری جەنگی نەگریس، تاوان‌و ڕووداوی سەمەرەی وای گرتوونەتە خۆی، کە هەتا هەتایە مۆری پڕ لە خەوشی‌و لەکەی ڕسوایین‌و، زەق زەق وان بەناوچەوانی بەدتەشکی شەڕخوازانەوە.

هەر لەسەردەم‌و کۆتایی جەنگیشا، لەهەموو کون‌و قوژبنێکی سەرزەمینەوە، دەنگی ڕەوای ئاشتیخوازی بەرزبووەوەو، هەمووان بەیەك دەنگ، هاوارو ناڵەی دلێرانەیان بەرزبووەوەو، سروودی پڕ ئاواتی کامەرانییان بۆ کۆترەسپی‌و بێگەردەکەی ئاشتی ئەچریکاندو، نەفرەتیان لە ملۆزم‌و مۆتەکەی جەنگ ئەکرد...

بەڵام چاوچنۆکەکان، مامە سام‌و دامودەزگاکانی بەرەی سەرمایەداری، لە ئاستی ئەم داخوازییە ڕەواو بەرزەی گەلانا، چاویان پەڕیوەتە پشت سەریان‌و، لە ترسی ئەوەی کارگەکانی شەڕیان لەکاربکەون‌و کەمێ قازانج‌و سوودیان بێتە خوارێ، (شەلم، کوێرم ... ناپارێزم) ئاسا، کەوتوونەتە وێزەی کۆترە نازدارە سپی‌و، هەزاران داڵە کەرخۆرەی دزێوو بەدتەشك‌و قەلەڕەشکەی ڕەزاگران‌و شوومیان تێبەرداوە، بەڵام ئەو خۆگێلکەرە چاوچنۆکانە بێئاگان، کە تا پەڕێکی ناسك‌و زیوینی کۆتری دڵی میللەتان ئەڗاکێ، بە هەزاران قەلەڕەشکەو داڵە کەرخۆرەی سەرەنوێلکی بەرەی شەڕفرۆشان ئەپرووکێن.. سەرەنجامیش گەلان هێمن‌و ئارام‌و دڵنیا، لە سای ئاسایش‌و ئاشتیدا ئەژین‌و نەیارانیشیان تەفرو توونا ئەبن...

گەلی کوردی قارەمانیش، هوشیارانە، تواناو هەستو دەنگی خۆی، داوەتە پاڵ هەموو جیهانو بەرەی ئاشتی،... نەبەردانە دژی جەنگ وەستاوەو، ویستوویەتی لە باوەشی لوتکە سەرکەشەکانی خۆیا ژیانێکی پڕ لە ئاشتیو ئاسایش بەسەربەرێ...

لەم هەڵوێستو راپەڕینانەشا، دیسانەوە (بەنگینە)ی شاعیری بەرەی گەلو ڕەشو ڕووتان، بەشی خۆی بەرکەوتووە ... لە ئەنجاما بەرلێشاوی تێلاو لیسو، فەلاقەی جەندرمەی ڕژێمی نۆکەرو پیاوانی مام ئیمپریالیزم کەوتووەو، لوولاقی وردو خاشبووە ... خێرەومەندان ڕایانڕفاندووە بۆ نەخۆشخانە ... لەو کاتەدا بە هەلو دەرفەتی زانیوە دەنگی خۆی بگەیەنێتە (ژین) ی هەمیشە ڕووگەیو دڵسۆزو دڵداری:

ئەی ژین، بەنگینە قاچی شکاوە
لەنەخۆشخانە کزو داماوە
ئاشتیخوازێکبوو، بێوەی، بێزیان
چەرخی شەڕفرۆش لوولاقی شکان

(بەنگینە) گەلێ شانازیی بەو سزاو ئازارو جەزرەبەیەوە کردووەو ... ئاواتەخوازبووە، ئەگەر هاتو لەم ڕێیەدا ڕۆیشتو سەرینایەوە، ئاشتیخوازانی دڵسۆزو گیانی بەگیانی، بیبەن بۆ لای شەهیدان لە گردی سەیوانی سەرکەش:

ئەگەر ڕۆیشتم بۆ گردی سەیوان
ئاشتیخواز ئەمبا بۆ لای شەهیدان

# "بەنگینەو لایەنی کۆمەڵایەتی"

ئەوانەی کە دراوسێی ئەم مرۆڤە بێگەردو خاکیو سادەیە بوون، زۆر بەشانازییەوە باسی پەیوەندیو بە دەنگەوەهاتنو ڕێزو، مشوورخواردنی دراوسێیەتیی بەنگینەی شاعر ئەکەنو گەلێ خۆزگە ئەخوازن کە تا کۆتایی تەمەن هەر دراوسێبوونایە ...

**بیرەوەریی دوو بەڕێز:**

زۆر بەپێویستو باشم زانی هەندێ بیرەوەریی دوو بەڕێز تۆمار بکەم، کە بۆماوەیەکی زۆرو لەنزیکەوە ئاگاداری گەلێ لایەنی ژیانی ئەم مرۆڤە مەزنە بوون. ئەمەش لەخۆیدا هەڵسەنگاندنێکی زۆر مەزنو بەجێیە.

★مامۆستا شێخ (محەمەدی شێخ جەلالی قەرەداخی)،ساڵی (١٩٢٥) لەدایکبووە، فەرمووی یەکەمین ڕۆژ کە چوومە قوتابخانەی زانستیی ئێواران (بەنگینە)م ناسی. زۆر زیرەكو بلیمەتو هوشیاربوو. هەموو جارێ لە پۆلو لە ڕیزدا مامۆستاکان ئەیانهێنایە دەرەوەو زۆر بەجوانی هۆنراوەی دەخوێندەوەو سەرنجی هەمووانی ڕادەکێشا.

(بەنگینە) مرۆڤێکی کارامەو ڕەنجدەر بوو. بە ڕەنجی شانو بازووی نانی پەیدا دەکرد. ئێواران دەفتەرو کتێبەکانی دەخستنە بندەستی، بەشەوقەوە بەرەو قوتابخانەی زانستی بەڕێدەبوو.

دواتر کە (بەنگینە) بووە خاوەن ماڵو منداڵ، لەگەڕەکی قەزازەکان بوو بە دراوسێمان...

(حاجی باقی بەنگینە) برایەکی هەبوو، ناوی (ڕەحمەتوڵڵا) بوو، لە گەراجی ئەسحابەسپی چایخانەیەکی زۆر باشی هەبوو، کە براکەی کۆچی دوایی کرد،

(بەنگینـە) چووە سـەر چـاپخانەکە. بەرووپـەکی زۆر خۆشـەوە پێشـوازیی لەخـەڵك دەکـردو بەشـێوەیەکی زۆر جـوانیش خزمـەتی هـەمووانی دەکـرد. ئـەم چـاپخانەیە بووبــووە ڕووگــەی ڕۆشـنبیران‌و کوردپـەروەران‌و نیشـتمانپەروەران. پەیوەندیشـی لەگەڵ دراوسێ‌و گەڕەکدا زۆر چاك‌و بێوێنەبوو.. بەڕاستی نموونەی مرۆڤـی دڵسۆزو دراوسێی زۆر باش‌و دروستبوو.

*مامۆستا محەممەد ساڵح دیلان ـ ی شاعیر لە گەشتێکی کورت‌و چڕی یادگاریدا دەربارەی (بەنگینە) گوتی:

لەسـاڵەکانی (١٩٤١ ــ ١٩٤٢) دا ـ ئـاوەزی ئـەوەم هـەبوو لەگـەڵ جـەماوەری شـارە ڕەنگینـەکەما بچمە گردی مامە یارەو کارێزی وەسـتا شـەریف، بـۆ سـەیری ئاهـەنگ‌و زەماوەندو هەڵپەڕکێی نەورۆز، کە پیرەمێردی نەمر سازیئەکردن‌و، سەرچۆپییەکەی ئـەگرت.. بـەر لـە سـروودی نـەورۆزی (١٩٤٨) " ئـەمڕۆژی سـاڵی تازەیـە نـەورۆزە هاتەوە..." کە هۆنراوەی پیرەمێردەو، مـن ئـاوازم بـۆ دانـاوەو، هـەر لـەو سەردەمەشـا چـڕیومە، بەڵـێ، لەسـاڵەکانی پێشـووتردا، سـروودێکی تـر ئـەوترا، ئـەویش هـەر هۆنراوەی پیرەمێرد بوو... کە بۆ یەکـەمینجار (بەنگینـە)م دی لەگـەڵ حـاجی عـەلی ماستاو، ئەحمەدی برینپێچ، جەلال قـادری ئینحیسار، سـروودی نـەورۆزیان ئەچڕی زۆر چووە دڵمەوەو زۆرم خۆشویست ئیتر لەوساوە بـەرە بـەرە لێـی نزیکبوومـەوە .. هەروەها مامۆستا دیلان گوتی: کە لەیەك گەڕەکیشا بـووین، تێکـەڵیمان زۆرتـر بـوو، زۆرتریش خۆشمویست‌و، ئەویش منی زۆر خۆشئەویست. پاش ساڵی (١٩٥٠) ش، دوای ئـەوەی لـە مەیـدانی بـەرینی ژیانـدا هەڵسوکەوتم زۆرتـر بـوو، گەلـێ جـار، پێکـەوە ڕۆژگــارێکی زۆرمــان لــە بەندیخانــەدا بەســەربردووەو، پێکــەوە تــاڵی‌و ســوێری‌و ئەشکەنجەمان چەشـتوون ... بەمچەشـنەو، ڕۆژ بـەڕۆژ پەیوەنـدی‌و خۆشەویسـتیمان بەرینترو پتەوتر ئەبوون ...

لە کۆتاییدا، مامۆستا محەممەد ساڵح دیـلان، بەمچەشـنە دوا وێنـەی زۆر پـوختی (بەنگینە)ی بۆ کێشاین:

هەتا بڵێی، پڕ بە واتای وتە بێوەزەندبوو، کوردێکی نیشتمانپەروەری بێگەرد، دڵو دەروونپاك، ڕاستگۆ، ئازاو چاونەترسبوو ... تا سەرینایەوە. لەهەڵوێستی زۆر ڕاستو دروستی خۆی لایەندا....

بەکورتی و بەڕاستی هیچکەس ناتوانێ هێندەی تۆزقاڵێك گەردی لێبگرێ ...

دیاریشە، کە گرنگترین مەرجی کۆمەڵایەتیی دروست ئەوەیە، مرۆڤ لە گەڕەکا ڕۆڵی پێویستی خۆی ببینێو ئەندامێکی زۆر بەکەڵكو کاریگەر بێ ... ڕاستو بەجێیشە، کە وتراوە، خراپەکاری زۆر ئاسانە، بەڵام چاکەکردنو ڕاگرتنی، ئەرکو کارێکی گرانە...

(بەنگینە)ش لەم ڕووەوە گەلێ پەندی وەرگرتوون، بەتایبەتی پەندە جوانو باڵاکانی پیرەمێردی مەزن.

بۆ خۆیشی لە ئەزموونی خۆیو کەسانی تریش کەڵکی وەرگرتووەو، بەشێوەیەکی جوانو بەجێ، زۆر لایەنی پتەوی کۆمەڵایەتیمانی خستوونەتە بەرچاو:

تـــــۆ وەرە تــــۆوی چاکـــە بچێنە
بــــــۆت دێتە بەرهەم کـــاتی دروێنە
خـــــــراپە هـیچـی لــێنایەتە بـــەر
بـــــەهیوای مەبە، تا ڕۆژی مەحشەر

لە هەڵوێستێکی ترا، شاعیرمان بەشێوازە سادەو کاریگەرەکەی خۆی، داوایکردووە، کە چاکەو چاکەکردن بۆ هەمووانبێت ... لە هەمانکاتیشا دژ بە هەموو زاراوەو وشەیەك وەستاوە، کە ئەبنەهۆی پچڕ پچڕیو دووبەرەکیو ناکۆکیو، وان لەخزمەتی ڕێبازی ئیمپریالیزمو دەستوپێوەنەکانیانا:

ئەگەر کردەوەی چاکت لە دەست دێ
هیچ فـەرقی مەکـە، شارسانو لادێ

هەرچەندە بۆ خۆی ماوەیەکی زۆر چاپچییبووە، لەگەڵ ئەوەشا گەلێ دڵتەنگو پەستبووە، لەوەی کە دیویەتی پۆل پۆل بێکارەو سستو تەمەڵ، هەمیشە لە کونجی چایخانەدا کەوتوونو لە بازنەی بۆشو بێهوودەدا کاتی زێڕینیان بەفیڕۆ ئەدەن، لەجیاتی ڕێزلێنانی یەکتر، دووکەڵی خەستو چڕی جگەرە ئەکەن بەسەروچاوی یەکتراو لەگەرمەی گەمەی دۆمینەو تاوڵەداو دوای گەمەش مەخسەرەو قەشمەریو توانجو دڵئازارییان بۆ ئەمێنێتەوە، بۆیە زۆر دڵسۆزانە تکایکردووە، ئەو کاتە بەنرخە لەڕێی ڕاستو بەکەڵکاو، بەدیهێنانی پاشەڕۆژی ڕوون بەسەر ببرێ:

تەمەڵی بەسە، مەچنە چایخانە

عالەم پێشکەوتوون، کورد چاوەڕوانە

جارێکی تریش، بەشێوەیەکی پڕ لە داخو هەناسەی سەردی جگەربڕەوە، سەرنجی سەرەنجامی ئەو لاوە گومڕایانەی داوە، کە لە ئاستی ئەرکی پیرۆزی سەر شانیانا، توند توند چاویان نووقاندووەو، ئاواتو ئامانجی چاوەڕێ لێکراویان بەنارەوا بە باداوە ... داخو ئەفسووسە، کە ـ ئارەق و قومار ـ ببنە ئامانجو کارو خولیاو ژینی مرۆڤ ... جا چ جا ئەو کەسەش لاوێکبێ، خوێنەوارییەکی زۆری بەدەستهێنابێ، و بەڵگەنامەی بالای لە گیرفانا بێ ... بەڕاستی ناخۆشە، لاوێکی وا، تا تەوقەسەری نوقمی کرداری قەڵبو هیچوپووچی نەزانانبێ:

ئارەقو قومار کەڵکێ ناگرێ

ئەم دووانە لاوی کوردی پێ ئەمرێ

حەیف نییە هەوڵی چەند ساڵەی خوێندن

جەهل داپیۆشێ وەك لیفەی دوژمن!!

دەك هەزار دروودو ئافەرین لە ڕەوانت ئەی (بەنگینە)، بەڕاستی هەڵقرچاوی، سووتاوی، جگەر براو و مامەخەمەی کۆمەڵی کوردەوارییی ...

# " بەنگینەو ڕۆژنامەو گۆڤار"

هەر لەگەڵ هەنگاونانی شاعیرمانا بەرەو قوتابخانەی زانستی، کە مەڵبەندی ڕۆشنایی‌و ئاواتی گەورەی هەمووانبووە، گورج‌و دەمودەست ئاوێزانی حەفتەنامەی ژیان ـ بووە، لەبەرئەوەی وەکو زمانحاڵی قوتابخانەکە بووە، ئەوەندەی تر بووە بە پەروانەو شەیدای هەمیشەیی ئەم حەفتەنامە پێشڕەوە گەشە تەمەنزێڕینە نەمرە. خۆشەویستی‌و خولیای شاعیرمان بەرانبەر بە حەفتەنامەی ـ ژیان ـ کە دوایی ناوەکەی کراوە بە ـ ژین ـ گەیشتووەتە ڕادەی خۆشەویستیی ڕاست‌و دروست.

کاتێ لە سەردەمی پاشایەتیی بێسەروبەرا، بۆ ماوەی چەند مانگێك ـ ژیان ـ داخراوەو، پاشان قۆرت‌و تەگەرەو کۆسپەکان لابراون، شاعیرمان یەکەم کەسبووە بەر لە هەمووان خۆشی‌و شادیی دەربڕیووە:

موبارەکبادیی دەورەی دووبـــــارە
وا ژیـــــایەوە ژیـــــان ئەمجـــــارە

ڕێزو پایەی (ژین) ی پیرەمێردی نەمر، لەچاو و دڵی (بەنگینە)دا، لەڕادەبەدەر بووە، فەرموون بابزانین چۆن بەڕێزێکی بەرزو پاکەوە ناوی ژینی بردووە:

ژینی خۆشـەویست، چرای نیشتمان
ڕۆشـــنایی چـاوی وردو درشـــتمان

بێگومان لە هەموو وڵاتێکا ڕۆژنامەی ئازادو سەربەست ڕۆشنایی و چرای نیشتمانەو، (بەنگینە)ش بەڕاستی، ڕاستی وتووە، کە ژین بووە بە چرای هەموو کۆڕێکی ڕۆشنبیری ...

لەگەڵ هەموو جەژنێکی میللی‌و ئایینیشا، شاعیرمان دەستپێشخەریکردووەو یەکەمینجار جەژنە پیرۆزەی لەگەڵ ژین‌و خاوەنەکەیا کردووە:

نەورۆزت پیرۆز ئەی ژین - ی سەربەست
یاخوا خاوەندو خۆت قەت نەبن پەست
جەژنت پیرۆزبێ، ڕۆژنامەکەی ژین
تۆ باخچەی گوڵی، بۆ گشت، بێپەڕژین
تۆ خونچەی دایم ئەگەشێیتەوە
وەك ئاوێنەی دین ئەدرەوشێیتەوە

کاتێ، ڕۆژنامە ئازادو سەربەستەکانی سەراپای ئێراق کەوتوونەتە بەر شالاّوی ڕژێمی پاشایەتیی دوابڕاو، جارێکی کەش ـ ژین ـ لەو پلارانە بێبەشنەبووەو، بۆ ماوەیەك داخراوە .. کاتێکیش دەرچووەتەوە هەمووان ئەوپەڕی شادیو بەختەوەریی خۆیان دەربڕیوە، شاعیریش چاك ئاگاداربووە، کە تا چ ڕادەیەك ژین ـ مەبەستو پێویستی ژیانی هەموو خاوەن ژینێکەو، بە زمانی هەمووانەوە گوتوویەتی:

ئەڵێن زۆر شوکر، ژین نەفەوتاوە
بۆ یادگاریی ولاّتمان ماوە

بەڕاستی ئەگەر ژیان ـ جا ـ ژین ـ نەبوونایە لەوانەبوو شیعری (بەنگینە) نەهاتبایەکایەوە، ئەگەر پیرەمێردی هەمیشە بەتواناو لێهاتوو و هەڵکەوتووش نەبوایە، چەندانی وەکو (بەنگینە)، لە گۆشەی فەرامۆشیدا ئەمانەوەو، ئەو دەرفەتەیان بۆ هەڵنەئەکەوت وەکو پێویست ڕۆڵی خۆیان بگێرن ... بەمچەشنەو ، بە تەواوەتیش (بەنگینە)ی خاوەن هەستی ناسكو قووڵو شاعیر، شاعیرانە پەی بەم ڕاستییە بردووەو، تا سەر، پەپوولەی گوڵزاری ژیانو ژین ـ بووەو، لێیان دانەبڕاوە...

لەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری هەمیشە ورشەدارو پڕشنگداری - گەلاوێژ - ی ئازیزو نازداری هەموو دڵسۆزاندا، کە قەڵای وشەی پیرۆزی مەیدانی بەرینو فراوانی ژیانی ئازادو سەربەستبووە، (بەنگینە)ی شاعیریش، تینو وزەی نوێ کەوتوونەتە کانگەی هۆنراوەیو، بەمچەشنە بۆ گەلاوێژ چریکاندوویەتی:

گەلاوێژەکەی بەرزیی ئاسمان
ئەستێرە گەشەی فەخری نیشتمان

کە سەردەمێکیش، تارادەیەکی زۆر ڕێ لەوشەی پڕشنگدار گیراوەو ڕژێمی ئەڵقە لە گوێی بیانی کەوتووەتە داخستنو ڕێگرتن لە گۆڤارو ڕۆژنامە ورشەدارەکان، ژینو گەلاوێژ - یش بەرکەوتوون، بەنگینەش بەمچەشنەی خوارەوە هەڵوێستی پیرۆزی دەربڕیوە:

ژین و گەلاوێژ، دوو شیعری میللی
هەرچی نەیەوێن تەوق بچێتە ملی

بەبۆنەی هەڵهاتنی گۆڤارە خنجیلانەکەی مامۆستای پایە بەرز — گیوی موکریانی، لە هەولێری دێرینو بەرین، بەڵێ بەبۆنەی تیشکی زێڕینی گۆڤاری — هەتاو — وە ، (بەنگینە)ش خۆی لەبەر تیشکی هەتاوی بەتین هەڵخستووەو گوتوویەتی:

گیانی شیرینم، گۆڤاری هەتاو
بەبۆنت شادبووم، ئەی گوڵی گولاو
خۆتت نیشاندام لەشاری هەولێر
بە ڕووناکیی تۆ دلان ئەبن تێر

# "بەنگینەو شەڕو گرانی"

دووەمین جەنگی زۆرداران‌و سەرمایەداران، چاوچنۆکان‌و ئیمپریالیزمی جیهانی، کوشتن‌و بڕین، مردن، سووتاندن، پەرشوبڵاوی، ڕووخاندن، برسێتی، هەتیوباری، هەژاری، کەساسی‌و ڕسوایی، بەڕووی سەرزەمینا بڵاوکردنەوە...

وڵات نەماوە دوچارو گیرۆدەی دەردی گران‌و سەخت نەبووبێ .. (بەنگینە)ی هەژارو، نزیک‌و ئاشنا بە هەموو چەرمە سەرێیەکی ژیانی دژواری، نزای شەڕو سەرنگوونی‌و ژێرەو زەبەربوونی ئاراستەی ئەوانە کردووە کە بوونەتە هۆی ئەو هەموو دەردو بەڵا گەورانە، بەر لەهەموویان هیتلەری نازی‌و فاشست‌و خوێنمژو نەفرەت لێکراوی دەستنیشانکردووە، ئەو هیتلەرەی بە خەیاڵپڵاوی خۆی، بەتەمابوو حوکمڕانیی سەراپای سەرزەمین لەژێر ڕکێفیا بێ ...

خـــــــوایە بیکــوژی زاڵمی زەمـــان
هــــــیتلــەر بــووەتە بــەڵای بێئامــان
ئــــــەوی ئەم شەڕو دەعوای کرد بەرپا
خـــــــوایە، تۆ گـــەردی ئەو بدەی بەبا

بەڕاستی ئەم نزایەی شاعیر گەلێ بەجێیەو هەمووان هەمانزا ئاراستەی شەڕنانەوەو ئاگر بەرپاکردن ئەکەن‌و ئافەرینی (بەنگینە)ش ئەکەن.

دەربارەی دڕندەیی‌و چاوچنۆکی‌و قەپاڵی گڵاوی بازرگانانی شەڕ، مامۆستای گەورەو نەمر (گۆران) ی مەزن، لەچوارچێوەیەکی وردو قووڵا، ئەم وێنەیەی دەربڕیووە:

خــــوای شەڕ ئینسان لە هاوجنسی
ئــــەکــا بە گـــورگـــێکـــی برسی!...

(بەنگینە)ش کە دیویەتی عەلافە بێوژدانەکان پێیان لێهەڵبڕیوەوەو، ویستوویانە ئەو هەموو خەڵکە داماڵن‌و دەستبگرن بەسەر پارەو ماڵ‌و دارایی‌یاندا، بێترس‌و لەرز پەردەی لەڕوویان داماڵیوە، جارێك چوواندوونی بە ئافرەتی لەشفرۆش، کە بۆ پارە هەموو شتێك ئەکات، جارێکی کەش بەوێنەی دۆزەخی مرۆڤهەڵلووش ئاشکرایکردوون، کە تا تێیئاخنری، هەر ئەڵێ: بابێ، ... لە کوێمە!!

نـــانەواو عـــەلاف بوونە غـانیە
بـــە (هـل من مزید) ناڵێن کـافییە!

(بەنگینە)ی شاعیری میللی، باش ئاگاداربووە، کە زۆربەی زۆری سەنگ‌و باری نالەباری گرانی، کەوتۆتە سەرچینی هەژارو داماوەکان، پارەدارە هەناو برسییەکانیش دەستیانگرتووە بەسەر هەموو پێداویستییەکانی ژیان‌و بریسکەی سمێڵیان هاتووەو کەیفیانکردووە، بۆ نا!! بەڕۆژی نیوەڕۆ تالانیانکردووەو کەسێك نەبووە، ڕێیان لێبگرێ:

کـــەچی بەهیچە، پەتی ئیحتیکـار
کـــەوتۆتە ملی فـەقیرو هـەژار
هـــەتا دێت نان‌و ڕۆن گرانئەکەن
بـــەکوردی، هەروا خەڵك تالانئەکەن

(بەنگینە)کە بینویەتی ئەو فرۆشیارو دووکاندارانەی بژێوی‌و ڕۆزی‌و خۆراکی ڕۆژانەی ئەم گەلە هەژارەیان پێسپێرراوە، دوور لەویژدان‌و داب‌و نەریتی مرۆڤ لێیان دزیون‌و شاردوویانەتەوەو دەستیان بەسەرا گرتووەو ئەمانیش بوون بەبازرگانی شەڕو چوونەتە سەنگەری بەرەی ناپاکان‌و ناحەزان‌و دوژمنانی گەل، یەکەو ڕاست‌و ئازایانە پەنجەی کردووە بە چاویاناو لەجێی گڵاوی پێشیاوی خۆیانا دایناون:

هێجگـــار بـــــايعـی خـــۆمان خرابن
لەڕاستی میللـــــەت بـە جەزب و جابن
قـــــەیناکـــا، ئێمە ئەوانمـــان ناسـی
ئـــــەوانە کـــەمتر نەبوون لــــە نازی!!

بەڕاستی، ڕاستو دروستە، کە وتراوە، ئەوی وا بزانێ بە پارە هەموو شتێ ئەکرێ، بۆ پارە هەموو شتێ ئەکات... ئەوەتا، شاعیرمان بەوردیو وریایی پەی بەم ڕاستییە بردووەو، ئاگاداربووە لە دوارۆژێکی زۆر نزیکا، تەنگانە بەسەرئەچێو ئاسوودەیی دێتە بەرەوە، چونکە یاساو دەستووری یەزدانە زۆردار تا سەر نامێنێ، چاویش بەچاو ئەکەوێتەوەو "ئێمەش ئەوانمان ناسین!!" ...

# "بەنگینەو نامەی بۆ شاعیران"

ئەم شاعیرە میللییەمان گەلێ ڕێزی لە هەموو ڕۆشنبیرانو شاعیرانو نووسەران ناوەو، بەسەریکردوونەتەوە...

لەساڵی (١٩٣٧) دا مامۆستا (شێخ سەلامی شاعیر)و چاونەترسو نەبەرد، دوور خراوەتەوە بۆ باشووری ئێراق، لەگەڵ سەرهەڵدانی جەژنی نەورۆزی ئەو ساڵەدا (بەنگینە) لەشێوەی کارتو برووسکەئاسا، جەژنە پیرۆزییەکی ناسكو بەکوڵی ئاراستەی شێخ سەلام کردووەو لەسەر لاپەڕەکانی ژیان ـ بڵاویکردووەتەوە، بەناوی هەموو قوتابخانەی زانستییەوە، لە گەرمەی ئاوارەییو دوورخراوەییدا، یادی بێگەردی کردووە:

زانســـتی ســەلام لــە سەلام ئـــــەکا
نەورۆز پـیرۆزی بە جەم جام ئـــــەکا

## پێکـمانەوە بێ بـــە دڵێکــی شـــاد
## کــارتی نەورۆزت دەرنەچێ لـــەیاد

کاتێکیش لەگونـدێکی زۆر دوورو چـەپەكو کلی وەکو دارۆخـان ـ ەوە مامۆستا قانع بەناوی پڕشنگی کچییەوە، بەهۆنراوە نامەیەکی نووسیووە بۆ کچانی سلێمانیو لە ژین ـ دا بڵاوکراوەتەوە، بۆ وەڵامی قانع بێجگە لـە بەنگینـەی نزیـك بـە هەسـتو هـەناوی، هـیچ شـاعیرێکی تـر بـە دەنگیــەوە نەچـووە، ... بـەم چەشـنەو بـەناوی "نەسـرین کچی بەنگینـە، وەڵامـی پڕشـنگ کچی قـانعی نووسـیوەتەوە.." وەڵامێکـی ڕێکـوپێکی قـانعی داوەتــەوە ... لێرەشـا بەسـەرکردنەوەی دووتـاك لـە هۆنراوەکـەی (بەنگینە) مەبەستمان بەدەستەوە ئەدا:

خوشکە گیانەکەم، پڕشنگ، کچە کورد
هـــاوارو بـانگــت زۆر تەئسـیریکــرد

لە کۆتاییشا بەمچەشنە خوشکە پڕشنگی ئارامو دڵنیا کردووە:

وا دارۆخــــان ـ یش مەکـــتەبنشـینە
مـەکتەب بۆ عــەرضـی کچـان پەڕژینە

(بەنگینــە)، گەلـێ مـەراقی کـەوی بـاشو ڕاوەکـەوی هـەبووە .. جووتـێ کـەوی زۆرباشی هەبوونو گەلێ خۆشیویستوون و بەمجۆرە ستایشیکردوون:

هەردوو کـــەوەکەم دەنگخۆشو نازدار
نایانگــۆڕمــەوە بـــــە بـازی ســــەردار

لەبەرئەوەی وەرزی ڕاوەکەو نزیکبووەتەوەو، ئەمیش ترساوە، هـەر وەکـو گوربـە، کۆترەکانی ئەحە جۆڵای بازرگانو شاعیری خواردوون، کەوەکانی ئەمیش بفەوتێن:

ئــەترســـم گـــوربە بیـــانفــڕێنێ
وەك كـــۆتری جۆلا، ملیان بشـکێنێ

ئاگاداریشبووە، كە كەوی ناوچەی قەرەداخ زۆر بلیمـەت و ئـازاو دڕو كۆڵنـەدەرو باشە، ... جا بۆ دابینكردنی جووتێ كەوی تـر یـادی مامۆسـتا قـانعی كـردووەو دەمـو دەست دەستیداوەتە خامەو بەهۆی ژینەوە، بەهۆنراوە نامەی نووسیوە بـۆ مامۆسـتا قانع، سا بەڵكو ئەمە خوایە بەدەنگییەوە بێت و كەوی باشی بۆ بنێرێ:

ئەبێ بنووسم لــە بۆ سـیـۆسێنان
بلێم كــاك قانع ئــامان ســەد ئامان
بــۆ ئەم بەهـــارە كــەوم بۆ بنێرە
بـا دانەمـێنم بــۆ كـــەوێ لـــێرە

كـە بـەهاری (١٩٣٩) ش بـەدڵی گـەلی كـورد نەگـەڕاوەو، خـەمو پـەژارە هـەمووانی داگرتــووە، (بەنگینــە) بەربووەتــە گیــانی ئــەو بــەهارە ناهــەموارەو، لەهەمانكاتیشـا پەنایبردووەتە بەر موفتیی پێنجوێن، كە پیشەی تووتن و جگەرەفرۆشی بـووە، داوای لێكردووە تۆزی ئەو تووتنەی هەڵیئەتـەكێنێ و ئەیبێژێتـەوە، بكاتـە هـەردوو دیـدەی بەهاری پاییز ئاسا:

موفتی ـ یەكەی پێنجوێن تۆزی تەماكۆ
توورەكــە بــێژ كـات بۆ دووچــاوی تۆ

لەساڵی (١٩٤٤)دا، مامۆستا مەعرووف جیاوك ــ ی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر كـراوە بە موتەسەریف ـ پارێزگار ـ ی سلێمانی و گەلێ پڕۆژەی ئاوەدانی جێبـەجێكردوون، (بەنگینە) بە هۆنراوەیەك هەستی خۆی بەرانبەر بەو پڕۆژانە دەربڕیوەو دیسانەوە

یادی موفتیی کردووەو، مزگێنیی داوەتێ، چۆن مزگێنییەك!! وەكو شانە هەنگوینی سپیو بێگەردی كوێستانەكانی پێنجوێن...

## لالۆی توتنچی چوار پایەی پێنجوین
## دەمت شـیرینكـەم بە شـانە هەنگـوین

هەوڵوكۆششی زۆرم داوە، بۆ بینینی وەڵامی ئەم سێ شاعیرە بۆ (بەنگینـە)، ... لەمو لەویشم پرسیوە، دیوانی سەلامو قانع ـ م پشكنیون، بە دیوانە دەسنووسەكەی موفتیشا چوومەتەوە، كە كاك ئومێد ئاشنا كۆیكردۆتەوەو ئەمڕۆو سبەی ئەكەوێتە بازاڕ، بەهیچ جۆرێ هیچ وەڵامێكیانم بەرچاو نەكەوتووە..!! ...

خۆ ئەگەر لە هەرساتو سەردەمێكا، لە هەركوێ ئەو وەڵامانە سەرهەڵبدەن، هەموو نیشانەكانی سەرسڕمان ئەڕەوێنەوە ... لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوونانەشا، ئەوە لەیاد ناكەین كە (بەنگینـە)ی شاعیر هەمیشە ڕاستگۆو ڕاستو دروستبووەو، نیازو دڵو قەڵەمو زمانو كردەوەی، هەموویان لەسەر ڕێبازی خزمەتی گەلەكەیا، یەكیانگرتۆتەوە، لەهەموو بۆنەو ڕاپەڕینێكی نیشتمانیشا، كەوڵسووری بەر لەشكر بووەو بەڕوونی جێی دیاربووە...

بەهەر جۆرێبێ، گەلێ جێی داخەو ئەبوایە هەرچۆن (بەنگینـە) لەسەر لاپەڕەكانی ژین، بۆ ئەوانی نووسیووە، ئەوانیش بە هەماندەستوور وەڵامیان بۆ بنووسیایە، یا ئەم وامەیان نەهاتایە سەر ...

# " بەنگینەو شین بۆ زاناو شاعیران"

(بەنگینە)، هەر وەك لەژیانا، ڕێزی زۆری لە زاناو شاعیران گرتووە، بۆ پرسەو چەمەریشیان ئەوپەڕی ڕێزو ستایشی دەربڕیوە ... لێرەداو بەکورتی کەمێ کزەو قرچەی دەروونی ئەم شاعیرەمان بە سەرئەکەینەوە کە بەبۆنەی کۆچی دوایی هەندێ لە دڵسۆزانی گەلی کوردەوە دەریبڕیوە ...

دەربارەی کۆچی مستەفا پاشای یاموڵکی، ئاگادار بووە، هەر چۆن سەربازێکی بەجەرگو نەبەزو دلێربووە، بەهەماندەستوور خاوەنی قەڵەمێکی زۆرباش‌و بەهێزو بە بڕشت بووە ...

سـاحێبی شـیرو قەڵەم بـە جارێ
ڕۆیی‌و فرمێسکمان لەچاو ئـەبارێ

شایانی یادخستنەوەیە، ئەم شیوەنە بۆ مستەفا پاشای یاموڵکی، یەکەم هۆنراوەی (بەنگینـە)یـە، کـە لـە (ژیـان)دا، ژمـارە (٤٧١، سـاڵی ١١ ، ١٤ی ئـاذاری ١٩٣٦) بڵاوکراوەتەوە...

بەبۆنەی کۆچی دوایی زانای گەورەو بەڕێز، شێخ عومەری قەرەداخی، هەستی خۆی‌و جەماوەری کوردی دەربڕیوە:

دیسـان وا شیوەن کـەوتەوە ناومان
خـەفەت جـۆشـئەدا دڵەی پڕ تاومان
چـاو پڕ لـەگریان، شـیوەنی نـۆیە
شـێخ عـومەر، ڕۆیـی، شین‌و ڕۆڕۆیە

بۆ كۆچی سەید عەبدوڵڵای خەتیب ـ یش، گوتوویەتی:

بــــا قــوڕ بـپێون ڕیشــسـپی و لاوان
هیجرەتی فـــەرموو سەیید لە ناومـان
شـەوقی بـەشـەوقی چرای دینمان ڕۆ
ســــەیید عەبدوڵڵای باخــی ژینمان ڕۆ

كـە لـەكۆتایی سـاڵی (١٩٣٦) داو، دوای مـەرگی ئـەم سـێ زانـا گەورەیـە، شـاعیری گـەورەو نیشـتمانپەروەریش ئەحمـەد بـەگی سـاحێبقڕان ــ كۆچـی دوایـی كـردووە، مەنجەڵی دەروونی (بەنگینـە) پتر هاتووەتە جۆش:

بیكەن بە تەئریخ ساڵەكەی سی و شەش
گـــەورە مردن بـــوو بۆ كـــوردان بە بەش

لەهەمانكاتا بۆمانی ڕوونكردووەتەوە، كە لەپاڵ خامە بەهێزەكەیا، خاوەنی بازوو و مەچەك و چەكێكی دلێرانەو مەردانەش بووە:

نـــــەوەی بەگــزادان ئەحمەد بەگـم ڕۆ
خـــــــاوەن قـەڵەم و سـاحێب چەكم ڕۆ

كۆچی ناوەختی مامۆستای داناو نیشتمانپەروەرو دڵسۆزی كورد ــ عەبدولواحیـد نووری ـ كارێكی قووڵی كردۆتە سەر هەستی شاعیرمان و زۆر هەژاندوویەتی:

ئـــەی دڵ وا ڕۆیی مـامۆســتای دانا
واحـــــید ئەفــــەندی، خـــاوەن تـوانا
لاوان ، هــــــاوارە، نیشــتمان، شینە
بــۆ مامۆســـــتای بـاش، دڵ پڕ برینە

بەبۆنەی کۆچی مامۆستای گەورەو ناسراوی کوردەوە زێوەری شاعیر وتوویەتی:

ئـــەی دڵ بنـاڵــە پـایـیزە، شـــینە
گـــــەڵاڕێـزانی درەخـــتی ژیــــنە
زێوەر، مامۆســـــتای زانستی جاران
ئێمەی بەجێهێشــــت کـەوتینە گریان

کۆچی قارەمـانی گـەلی کوردمـان، شـێخ مـەحموودی نـەمر کڵپەیـەکی لـەپڕ بـوو، بەربووە سەراپا هەستو هۆشو هەناوی هـەمووان ... (بەنگینـە)ش بـە چامەیەکی سەراپا بورکانەوە، هاوارو ناڵەی بەرز بوونەتەوە:

ئەی دڵ کــــۆستی وا هەر نەبینراوە
بۆ هـــەڵناقرچـێی بــە دەم جــەفـاوە
هــــــاوار سـێبەری نیشــتمـــانم ڕۆ
ســـــەرداری گـــەلی کــوردستانم ڕۆ
شــــــەڕی دەربەندو بــەردەقــارەمان
بــووە بـــە مـێژوو بۆ گــەلی کـوردان

بۆ کۆچی دوایی مامۆستای نووسەر و زانـاو ئـەدیبی بـەرزو نـاوداری کـوردیش ــ ڕەفیق حیلمی ـ وتوویەتی:

ئـــەی دڵ وا دیســـان کوڵی گـــریانە
بۆ زانایەکـی ئـەم کـــــوردســـتانە
بەپێنووس، بــەشــەو، هەتاکو بەیان
بۆ حــەق ئەگـــــەڕا، بۆ گەلی کوردان
ناوی ونـنـــابێ لــــەناو هـــۆزی کورد
باش تێئەکـۆشـــا، زوو بەدەستوبرد

بەمچەشنە بۆمان دەركەوت، كە (بەنگینە) لەیادكردنەوەی زاناو شاعیرو نووسەرانا هیچ درێغینەكردووە ... بەڵام هەزاران ئەفسووس و داخ، كە لەدوای كۆچو مەرگی ئەم شاعیرە میللییە بلیمەتەمان وەكو ئەرك‌و پێویست‌و لەبوارو كاتی خۆیا بەسەرنەكراوەتەوە.

جا هەر وەكو پێشینانیشمان فەرموویانە:

**"مامە ، دنیا دەستەوامە"**

دیارە كە ئەم وام‌و قەرزەش بەسەرهەمووانەوەیە، ئەم پێزانین‌و وامەش هەر لەژیانا بدرێتەوە باشترە، خۆ ئەگەر لە ژیاناو، دوای مەرگیش بدرێتەوە، ئەوا زۆر باشترو، ڕووناكییەكەش چەندین قاتئەبێ...

**عوسمان محەممەد هەورامی**

١٠/ ٨/ ١٩٨٨

## (( رێنەدرا دیوانەکە چاپبکرێ ))

دوای کۆکردنـەوەو ئامـادەکردنی ئـەم دیوانـە، (کاکـە نـووری) لەچاپدانەکەی بـۆ نەچووە سەر، ئەوەبوو بردیە هەولێر، بەو هیوایەی ناسیاوێکی دەسەڵاتدار چاپیبکا، دواتر بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ئەمینداریێتیی رۆشنبیریی ئەوسای رژێمی سەرنگوونکراو لەهەولێر، مایـەوەو سـەرەنجام درایـە دواوە.. بێگومـان هـەر لەبـەر ئـەوەبوو، سـەراپا هۆنـراوەکـان رێچـکەی نەتـەوەییان گرتۆتەبـەرو پـڕن لـە کڵپـەی نیشـتمانپەروەریو مرۆڤایەتی.

ئەوە بوو، لە ڕەوە مەزنەکەی ساڵی (١٩٩١)دا ، ماڵەکەم، کـە لـە گـەڕەکی (ڕزگـاری) بوو، تـالاّنو بـڕۆ کـرا. زۆرتـرین زیـان بـەر کتێبخانـەی (٣١) سـاڵەم کـەوت. باشـبوو ، تاکوتەرا هەندێك دەستنووسو کتێبم بەرنەکەوتبوون، لەوانەش ئەم دیوانە جوانە.

لەهەمانکاتــدا دڵنیــام لــەملاو لــەولاش هــۆنراوەی دیکــەی (بەنگینــە) هــەنو بەردەستم نەکەوتوون هیوادارم بەردەستبکەونو لـە ئاینـدەدا جێـی خۆیـان بگـرن... کاکە (تۆفیق بەنگینە) ـ کوڕی شـاعیر، وتـی: لەبـەر تـرسو لـەرزو تۆقانـدنی ڕژێمـە فاشستەکان، گەلێك هۆنراوەی سووتێنراون، یان کراون بەژێر گڵەوەو ڕزیون.

### سەرنج و تێبینی:

ڕۆژی (٨/ ١٢/ ١٩٨٨) ، لەهۆڵی جەماوەر، لەسلێمانی، کە ئێستا هـۆڵی ڕۆشـنبیرییە، کۆڕێکم بۆ ڕێکخـرا، بڕیـار بـوو ئـەم (بەرلەپێشـەکی و پێشـەکییە) لـەخۆبگرێ. دوو خولـەك پـێش دەسـتپێکردنی کۆڕەکـە، بەرپرسـی هۆڵەکـە هاتـە لامـەوەو، چـرپاندی بەگوێماو گوتی: ئاگاداربـە، چـەند بەرپرسـێکی (ئـەمن) دانیشـتوون ! ... بەداخـەوە، لەو تەنگژەیەداو بەگوێرەی توانا، توانیم چەندین لاپەڕە وەلانێم.! ..

# پەریڤێک

گۆشەیەکی دیکە لەچالاکییەکانی (بەنگینـە)، کـە پێویستـە باسـی لێـوە بکرێـت و وەك مێژوویەکی پرشنگدار لەژیانی ئەم شاعیرەدا تۆمار بکرێت، بەشـداریکردنیـەتی لە خۆپیشاندانە سەرەکییەکانی شاری سـلێمانی، کـە لەسـەردەمورۆژگارە سـەختەکان، لەدژی ڕژێمی ئەوسا بەرپێوەچوون، (بەنگینـە) تـەنها لـەرێگای شـیعرەکانیەوە گیـانی نیشتمانپەروەری‌و خەبات‌و کوردایەتیی لەهزری گەنجان‌و لاواندا نەچـاندووە، بـەڵکو وەك کەسێکی چالاك لەریزی پێشەوەی خۆپیشاندەراندا بەهوتاف کوردایەتی‌و دەنگی بلند جەماوەری راکێشاوەو هەستی هـەموانی بزوانـدووە، ئـەم ئامادەبوونـەی شـاعیر پێمان دەڵێت (بەنگینـە) لەگـەڵ گـەل‌و نەتەوەکـەی خۆیـدا ڕاسـتگۆ بـووە، ئامـادەیی خـۆی‌و وشـەو شـیعرەکانی کـە هـەڵقولاوی دەروونـی پـڕ جـۆش‌و حەماسـەت بـوون، لەخۆپیشـاندانە سـەرەکی‌و ڕێپێوانـەکانی دژ بـە ڕژێمـی ئـەو سـەردەمە وێنەیـەکی جـوان‌و ڕاسـتگۆیانە دەبەخشـنە ئـەم شـاعیرە. گومـانی تیانییـە بەخشـینی نازنـاوی (شاعیری گەل) هەر لەوێوە سەرچاوەی گرتووە، چاپخانەکەی (بەنگینە) جگە لـەوەی شـوێنی بـژێویی بـووە، مەڵبەنـدی کـۆڕو کۆبونـەوەو بـیرورا گۆڕینـەوەی کەسـیەتی سیاسـی‌و ئـەدیبان‌و شـاعیران‌و ڕۆشـنبیران بـووەو هـەر لەوێشـەوە خۆپیشـاندانە سەرەکییەکان، یان گردبوونەوەو ڕێپێوانەکانی شاری سلێمانی بڕیـاری لێـدراوە. کـاك (ڕەزاقی حاجی کەریم) بۆ (خەبات) ی برامی گێڕاوەتەوە ( لەپرۆسـەی هەڵبـژاردنی ساڵی (١٩٥٤)دا، کە لای خانـەقاوە ئەنجامـدراوە، مامۆسـتا (ئیبراهیـم ئەحمـەد) وتـاری خوێنـدۆتەوەو پاشان (حـاجی بـاقی بەنگینـەو کامـەران مـوکری)ی شـاعیرو هەنـدێك کەسیەتی دیاری تری شـاری سـلێمانی وتـارو شـیعریان تیـا خوێندۆتـەوە. دوای ئـەوە ڕوویانکردۆتە (تەینـاڵ) بـۆ چاپخانەکەی (عـەلی دەدە)، (نـووری ئەحمـەدی تـەها)ش یـەکێکبووە لـە بەشـداربووەکان‌و لەوێشـدا بـەو بۆنەیـەوە حـاجی بـاقی شـیعری

خوێندۆتەوە)... سەبارەت بە پرۆسەی خوێندنو زانست بەهەمانشێوە ئەو کاتێك باسی لە پێگەو قورسایی و گرنگی زانست و خوێندن بۆ گەنجانو لاوانی گەلی کورد کردووە، خۆیشی یەکێکبووە لەقوتابیانی زانستی ئەو کاتەی قوتابخانەکەی شاعیری نەمر (پیرەمێرد)، ئەم هاوتەریبیو جووتبوونە لەنێوان گوتارو کرداردا لای (بەنگینە) وێنەی ڕاستگۆیی ئەومان پێدەبەخشێت! دیارە قوتابخانەی زانستیی ئێواران بۆ ئەو کەسانە بووە کە بەرۆژ بەهۆی سەرقاڵی ژیان و گوزەران و نانپەیداکردنەوە بواروکاتی ئەوەیان نەبووە ڕوو لەزانستو خوێندن بکەن .

<u>کاك حەمەچاوشین لەئەکاونتی خۆی لە تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبوکدا نووسیویەتی:</u>

( (حاجی باقی بەنگینە) کەسیەتییەکی گەورەو دیاری شارە شیرینەکەی سلێمانی، مرۆڤێك پڕ لەهەستی نەتەوایەتیو کوردێکی بێخەوشو تێکۆشەرو شاعیرێکی نیشتیمانپەروەر، کاتی سەرهەڵدانی لاویم بەهۆی کارکردنم لەناو گەراجەکەی ئەسحابەسپی، ئەم پیاوە ناودارەم ناسی کە خاوەنی چایخانە گەورەکەی ناوڕاوەی دەرگا سەرەکییەکەی گەراجەکەبوو، ئەو چایخانەیەی مەڵبەندێکبوو بۆ زۆرێك لە کەسێتییە ناسراوو دیارەکانی شار، لە خۆشەویستیی خۆیو جوانیی ناو چایخانەکە بەخوێندی کەوو کەوباڕەکانی ناو قەفەزەکان، بە بەکرە گۆرانیو مۆسیقا هەمەرەنگە کوردییەرەسەنەکان، بە ئامێری گرۆندیکی (TK 20)و هاتنی ڕۆژانەی کۆمەڵێك کەسییەتی لەهونەرمەندانو شاعیران، کە هەرگیز ئەم جوانیانە بیرناچنەوە، جێگای شانازیمە کە زۆرجار لەو چایخانەیەدا یارمەتیمداون بەکۆکردنەوەی پیاڵەو جامولکەی ماستاوو پاککردنەوەی تەپڵەکەکان بەخۆشەویستیی حاجی باقیو جوانیی بەسەربردنی ئەو ساتە پڕ لەشەوقوزەوقە لەیادنەچوانە، (بەنگینە) چایخانەکەی لانەی هەزارو لێقەوماوانبوو، خزمەتی ئەکردنو شەوانە لە چایخانەکەدا شوێنی خەوتنی تەرخانکردبوو بۆ لانەوازان، (بەنگینە)ی بەهەشتیی تا باس لەجوانی کردارەکانی بکرێت کەمە.. درود بۆ گیانی پاکی ئەو مەزنە)..

**کاك فەوزی ڕەمزی مەلا مارف لەهەمان تۆڕی کۆمەڵایەتی بۆ کاك حەمە چاوشین دەنوسێت:**

(کاتی خۆی (بەنگینە) ئەو گچکە مەڵبەندەی کە هەیبوو جێژوانی ئاشقانی نیشتمان و گەلبوو.... جێژوانی ئەدەبدۆستان و شاعیرانبوو .... ئای تازەگەری چۆن ئەم میلەتە بێنەوایەت سەرگەردانکردو کەس پێشینەی خۆی نازانێت و هەر ڕاکردنە بەدوای ئەدەبیاتی بێگانەدا).

هەر لەڕێگای فەیسبووکەوە کە بۆی ناردووم مامۆستا فەوزی نوسیوویەتی: (زۆرجار لەخزمەت باوکمدا دەچووم بۆ سەردانی برادەرەکانی لەوانە حاجی ئەحمەدی کەریم ئاغا لەخانی تازە، حاجی ئەوڕەحمانی مەلا سەعید لەسەر جادەی کاوە، بەڵام پێش ئەوە سەردانێکی (بەنگینە)ی دەکردو هەر لەدوورەوە دەیگووت ها "نگین " چی تازەت پێیە؟.... ئەویش بەو پەڕی ڕێزەوە دەیگوت ( دە تۆ جارێ چایەکی بۆنخۆشی خەلیسمان لا نۆش بکە ئەوجا ....)، ئیتر دەکەوتنە دەمە تەقەی شیعرو باوکم هەر دەیگوت ئافەرین نگین ( نگین بۆ وەخن و ڕێزە). دیارە لای باوکم ڕێزی خۆی هەبووە .... هەروەها کاتێك " بێخود " ی خاڵی باوکم چلەی ماتەمیان بۆ گێڕا، لەدیوەخانەکەی ئێمەدا دانیشتن و هەڵسەنگاندنی شیعرەکان دەکرا... باوکم ئەو شیعرەی (بەنگینە)ی پەسندکردو هەموو دەسخۆشییان لێکرد تا لەماتەمینییەکەدا بیخوێنێتەوە.... باوکم بەردەوام دەیگووت شیعری (بەنگینە) لەدڵو سینەیەکی پاکەوە هەڵدەقوڵێت)..

(بەنگینە) بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی نەتەوەکەی بەئەرکی خۆی زانیوەو لەلایەن ڕژێمی ئەوساوە بەهۆی هەڵوێستی کوردایەتیو تێکۆشانو نیشتمانپەروەرییەوە ڕووبەڕووی زینداނو ئەشکەنجەو ڕاوەدوونان بۆتەوە، لەبەر هەستیاریی سەردەمو ڕۆژگارە سەختەکان نەتوانراوە زۆرێك لەشیعرەکانی (بەنگینە) بپارێزرێنو فەوتاون، سەرباری ئەوەی شیعرەکانی (بەنگینە) پێش ساڵی (٢٠٠٣) نەخراونەتە دووتوێی کتێبێکەوەو تاکە سەرچاوە هەفتەنامەی (ژین) و(ژیان)و گۆڤارە کوردییەکانی سەردەمی خۆی بوون، کەچی شیعرەکانی هەتا ئەمڕۆ لەبیرو هزری زۆرێك لەجەماوەری زەحمەتکێشو خەڵکی ڕۆشنبیرو کەسێتییە سیاسییەکان

بەتۆمارکراوی ماوەتەوە !! مانەوەو تۆماری شیعرەکانی (بەنگینە) لە بیرو یادی مامۆستا عومەر مارف بەرزنجەییدا نموونەیەکی زیندوون کە ماوەیەکی کەم پێش ئێستا چاوم پێیکەوت، هەروەها سالّی (١٩٧٨) لە قەندیل بەڕێز (مام جەلال) دوای یەکترناسین لەگەلّ کورەزای (بەنگینە) (شەهید دلّشاد تۆفیق) پێیگوتووە من شیعرێکی باپیرت بۆ ئەلّێمو هەرلەوێدا شیعرەکەی بۆ خوێندووەتەوە !

ڕێبوار تۆفیق بەنگینە
کورەزای بەنگینەی شاعیر
سلێمانی / ١٥ /٩/ ٢٠١٦




ئەوا من مردم نەگەیمە ئاوات
لاوان، لامەدەن لەکۆڕی خەبات
"بەنگینە" هیوای وایە بەیەزدان
هەر ئاوەدانبێ خاکی کوردستان

# شینی مستەفا پاشای یامولکی*

ڕۆژی یەکشەممەوو، ئێواریٚ درەنگ
شارمان لێشێوا، بوو بە شەوەزەنگ
وتیان جەنازەی پاشا دەرکەوت، هات
شین و واوەیلا کەوتە ناو ولات
دوو فەوجی جەیشی چوو بە پیرەوە
تفەنگ سەرەوژێر، بەڕووی زویرەوە
بۆڕیەی سەلامیان لێدا بۆ ماتەم
چاو پڕ لە فرمێسك، دەروون پڕ لەخەم
مەیت هات، گەیشتە بەردەرکی سەرا
بانگی ماتەمیی کوردان هەڵدرا،
پاشای بێحاشای قەومی کوردم ڕۆ
لە کەس نەترساو مەردی گوردم ڕۆ
ساحێبی شیرو قەڵەم، بە جاریٚ
ڕۆیی و فرمێسکمان لە چاو دەباریٚ
درێغ، سەد درێغ چەرخی چەواشا
خستینیە تەعزیەی مستەفا پاشا[1]

---

* ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە، ٤٧١، ساڵی ١١، ١٤ی ئازاری ١٩٣٦، مستەفا پاشای یامولکی (١٨٦٨ ـــ ١٩٣٦) یەکێکە لە پیاوە ناودارو هەڵکەوتووەکانی کورد، لەسوپای عوسمانلیدا گەلیٚ پلەی بەرزی بەدەستهێناون، تا بووە بە میرئالاّو سەرەك دادگای عورفی لە ئەستەموولّ.

(١) درێغ: حەیف، بەداخەوە

خـــــۆی ڕۆیـی و نـــــــاوی لـــــــه دڵمـــانـایه
کــــــورد قـــەدری گـــەورەی خــۆی زۆر لـــەلایه
نــــــەڵێن (بەنگــینه) بـــــۆچ وا بـــــه کـــــوڵه
فرمێســــــکی چـــــاوی شـــــــیوەنــی دڵـــــــه
دڵـم لـــێڵـیاگـــــــــه، بـــــــه جـــۆری جـەیحــــوون
دووکـــــەڵـی ســــــینـەم بگـــــــاته گــــەردوون[٢]

[٢] لێڵیاگه: لێڵبووه

# یاخوا هەربژی *

یاخوا هەربژی پیرەمێردی کورد
لە ڕێی خزمەتی کورد بە دەستوبرد
تەئریخی کۆنمان بۆ بدۆزەرەوە
بە فەنن و خوێندن سەرمانخەرەوە
گوڵخونچەی باغی مایەی ژیانم
هەروەکو بلبل شەو بە گریانم
ئوستادی شیعرو (بە)[1] ئەدەبییەکەت
بێنە ماچیکەم ڕیشە سپییەکەت
دەردم سارێژکە، لەگەڵ برینم
تاجی سەرەکەم، مەرگت نەبینم
سینەم هەڵدڕن بەهێڵی گاسن
دڵم بێننەدەر، ئنجا لێیپرسن
بەدەم خوێندنو، بەچاوی گریان
ئەگریم، دەناڵم تا بەری بەیان

---

* ڕۆژنامەی ژیان، ساڵی ١١، ژمارە ٤٧٢، ٢١ـ ٣ـ ١٩٣٦، ناوی شاعیر نەنووسراوە، کاك لەتیف قەرەداخی بۆیگێڕامەوە، وتی: (لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٦٠ دا، کە یادی پیرەمێردی نەمر کرایەوە، (بەنگینە)ی شاعیریش کە هاتە سەر میکرۆفۆن وتی: کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی ژیاندا، ئەم هۆنراوەیەم بڵاوکردۆتەوە، ئێستاش لەیادکردنەوەی پیرەمێردی نەمردا، دووبارە پێشکەشینەکەمەوە بەگیانی ئەم نەمرە.

[1] پێموایە وشەی (بە) وشەی (با) ی فارسی بووە، بە واتای (لەگەڵ) ... لەچاپدا وایلێهاتووە... واتە مامۆستای شیعرو ئەدەب.

سـەرم هەڵبڕی ڕوومکردە ئاسمان
دوعای خێرم کرد بۆ قەومی کوردان
ئەمن بناسە، فەرهادی چینم
وێڵ و ئاوارەی خاکی شیرینم
قولنگ بەدەستم، بێستوون کونئەکەم
خۆشی خۆشیمە، شیرین وننەکەم[2]
نامەم بۆ نووسیت بە خوێنی چاوم
بۆ قسەی جوانت هێجگار سووتاوم
هیچ عاجز مەبە بە گفتوگۆکەم
سەرداری قەومی، گەورەی خاکەکەم
بژی هەربژی زانستیی کوردان
هەزار هەژاری هێنایە مەیدان

---

[2] قولنگ: پاچ

# بۆ نەورۆز*

نەورۆزە، یاران، ڕوو لە سەحراکەین
بەخۆشیی وڵات ڕاکەین، هەراکەین[1]
ئەوا بەهار هات سەحرا سەوزەیدا
موژدەبێ پۆلی هاوشوێن‌و برا
وا خوێندەواری زانست پێگەیی
نەخوێندەواری کەوت، لووتی نەوی
بەفری دڵساردی ڕۆیی لە شاخان
سەرینایە چۆڵ بەفراو لە داخان
موژدەی بەهاری بۆ ئێمە هاورد
بلبلان شادبوون، چەمەن گوڵیکرد
وا ڕۆیی سەرمای خاتوو زەمهەریر
سەحرا گوڵگوڵ بوو، وەك تافتەو حەریر[2]
شارەزوور سووربوو، دڵ ناگرێ قەرار
بۆ دینی تیلای چاوی پڕ خومار[3]

---

* ژیان، ساڵی ١١ ، ژمارە ٤٧٢، ٢١ی مایسی ١٩٣٦.

[1] سەحرا: دەشت‌ودەر.    هەراکەین: هەڵپەڕین‌و قاو و عیوکەین.

[2] گوڵگوڵ: ڕەنگاوڕەنگ.    تافتە: جۆرە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگ‌و جوانە.
زەمهەریر: تۆفی سەرماو سۆڵە، زریان.

[3] دینی تیلای: بینینی نێو نیگای.

تــــاریدەر پڕ گــــوڵ، ئێســــــتا ئەکـــــا تـــاف

هـــــەر چــــــاوەڕوانە بــــۆ هــــــاتنی جـاف[٤]

مــن لــەنجــــەو لاری گــوڵـــــی هـــــــەوری لار

لـــــــەلام جـــــوانترە لـــە گــوڵی بــــــــەهــار

کــە دائەنیشـــــــن لـــــــە ســــــایەی ڕەشـــماڵ

پەرچەم پەرێشــــــان، تێکــەڵ بـــــە دەســـــماڵ[٥]

دڵگـــــیریی وەتـــــەن، شـــــیرینیی بــــەهــــــار

دڵـــــم زۆر کـــــــەیلـــــە بـۆ گــــــریـــانو زار

---

[٤] ئەکا تاف: تافی ڕازاندنەوەیەتی، ئەشکرێ بگوترێ گەرمەی خوڕەی تاڤگەو کانیاوەکانیەتی.

[٥] پەرێشان: پەخشانو بڵاو.

# نـــــەورۆز*

نەورۆزمـــــان، شـــەممو ســـاڵمان لا خۆشـــــە
بـــە نەشـــئەی ســـەیران دڵمان بـــە جۆشـــــە
نـــەورۆزی زانســـــت ئیمســـاڵ دوو جـــــەژنە
بـــە شـــــەرقیی کـــــوردیو دەهـۆڵو زوڕنـــــا
قــوتابیی زانســـت ڕوویکـــردە ســـــەحرا[١]
ڕۆژێ بــــــوو دنیـــای تیـــا ژیـــایـــەوە
میللـــەت بــــــەجـــارێ گشــــت گەشـــایەوە
عەســـکـــــەری عـــێراق، دەســــتووری زاخـــۆ
هەڵپەڕکـــێیان بوو، هــــــەموو لـــە ســــەرخۆ[٢]
(پـــیرەمـــێرد) خۆشــــبێ جـــــەژن زۆر مـــاوە
ســـــــەیـــرانی کـــەمــــان وا لــــــە دواوە
ئێمـــــە مەمــــــــنوونین لــــەو مـــیوانـــانە
کــــە وا هـــــاتـبوون بۆ ئــــەو ســــەیرانە، ...
مـــن کـــە لاوێکـــــبووم، ئەووەڵ هـیچ نــــەزان
بـــە خـــوێندنی زانســـت هـــاتوومـــە مـــەیدان
نــــەك بۆ مــــەیدانی مەشــــــرووبو قـــــومار
بــــەهـۆی عـــیلمــــەوە، بـۆ قســـەی ئـــاودار[٣]

---

* ژیان، ٤٧٥، ١٨ی نیسانی ١٩٣٦.

[١] شەرقی: سروود.

[٢] سوپا: لەجەژنی نەورۆزدا بەشداریکردووەو بەشێوەی بادینی هەڵپەڕیون.

# بەهار*

وا نەوبەهاری ساڵی خۆشیمان
مژدەی سەربەستی دا بە نیشتمان
مژدەبێ، یاران مانگی گوڵانە
ڕۆژی یەکیەتی و دەستلەمالانە
بڕواننە کێوو خەیمەی گوڵاڵان
شنۆی نەسیمی بەری بەیانان
سەیری گۆیژەکەن، وەختی نیوەشەو
لە نەغمەی بلبل، قاسپە قاسپی کەو
دنیا مەستبووە لە دەنگی خۆشیان
دەنگیدایە کێو جۆش و خرۆشیان
ئەمڕۆ مژدانەی خۆشی و هەستییە
کاتی سەیرانە، هی زانستییە
وا مژدەی بەهار درا بە بڵبڵ
بە زانستیمان شادی کەوتە دڵ
دڵ بە کەیفخۆشی ڕوویکردە ناو دەم
وتی مژدە بێ، لای من نەما خەم
دەم ڕوویکردە دڵ، مژدە بێ، بە چاو

---

(٣) قسەی ئاودار: وتەی بەنرخ و بە کەڵك.

* ژیان، ژمارە ــ ٤٧٦ ـ ساڵی ١١، ٢٥ی نیسانی ١٩٣٦.

ئەبینی ڕۆڵەی بەکار هاتە ناو
ڕۆڵەی خوێندەوار، زانستیی کوردان
کەوتۆتە سەری کردەوەی جوان

## دواکەوتنی هۆزم*

پرسیم لە سیروان، پایزو بەهار لێڵ
سەیرانگای ئاهوو، هۆزو تیرەو خێڵ(١)
چەند ساڵە دەورەی ژیانت نەدی؟!
بەرقی سوارانی کوردانت نەدی؟!(٢)
جوابیدامەوە چەمی کۆنە ساڵ
لێمهاتە جواب بە زبانی حاڵ
وتی ئەوسا کورد لەلام میوانبوو
خاوەن سفرەو نان، گشت حوکمڕانبوو
زۆری پێنەچوو، چەپگەرد وەرگەڕا
قاپیی ژیانمان لەسەر داخرا
فەلەکزەدە بووم، چم پێنەکرا
دەوران چەپۆکی کێشام بە سەرا(٣)

* ژیان، مارە ـ ٤٧٧ ـ ٢ی مایسی ١٩٣٦.

(١) ئاهوو: ئاسك.

(٢) بەرقی سواران: بریسکەی شمشێرو خەنجەرو رمی سوارانی جەنگاوەرو چەخماخەی ناڵی ئەسپەکانیان.

(٣) فەلەکزەدە: پێکراوی گەردوون. چم: هیچم

ڕۆژی شـــادیمـان بـــەشـــیوەن گـــــەڕا
حـالْمـان خـــراپبـوو، کـــەوتینە هــــــەرا
ئــــومـێدمان مـــاوە ئێســـتا بـــە یـــەزدان
بــــەهـــۆی عــــیلمــەوە دێینــەوە مـــەیدان
ئیـــتر هــەربــــــــژی زانســتی کــــوردان
بـۆ پێگـــــــەیانــدن لاوی کـــوردســــتان

## سوئالو جواب*

ڕۆژێ چـــــوومە بـــــاخ بە ســـەیری گـــولاّن
بـــۆ گـــوێگــرتنی نەغـمـــەی بــــلْــبـــلاّن[1]
پرســــیم، ئـــــــەی گـــوڵە بۆچ پەشـۆکـاوی
بـــــۆچ وا پەشـــــۆکـاو، زەرد هەڵگـــــەڕاوی!
جـــوابیدامــــەوە گـــوڵخونچەی بەهـــــــــار
بـەشـــــــینو زاریـی دڵــــەی بێـقـــــــــەرار
کــــــزەی ڕەشــــەبا شکـــاندی بـــــاڵــم
شــــــەماڵ نەمگـاتێ وەك کـــۆی زوخـــاڵم
بۆم نـــــــایە هــــەوای شـــارەزوورەکـــــەم
بـۆیـــــــــە زەردبووە ڕەنگــــە ســـوورەکـــەم
کــــەی مـن گــولێبووم بچمــــــــە ئینجـــانە

---

* ژیان، ژمارە ٤٨٠ ، حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٦.

(١) بلبل: بولبول، بلْبلْ، بە هەرسێ جۆرەکە هاتووە.

جێی نەشونمام کۆی بەرانانە
تەنیا گوڵێبووم بەدەم یاڵەوە
ئەشنیام بەدەم بای شەماڵەوە[٢]
بەهاران وەختێ کە داریدەکرد[٣]
ئەدرەوشایەوە چووزەرەم ورد ورد
هاوینان، فەسڵێ دروێنە ئەکرا
عەتری گوڵاوم بە شووشە ئەبرا
پاییزان، کاتێ گەڵاڕێزانبوو
بلبل بە شێوەی من پەرێشانبوو
جێگاکەم بەرزو شاهی شاخانبوو
ئاگام لە عێلی سەر کەلیخانبوو
گوڵخونچەی باخی ژیان ئەمنبووم
ڕووناکیی چاوی کوردان ئەمنبووم
فەلەك کە زانیی ئەگەشێمەوە
وێنەی ئاوێنە ئەدرەوشێمەوە
لقوپۆپی وا بە زۆر شکاندم
لە باخی ژیان دەرپەڕاندم
ئومێدەوارم، ئێستاش بە یەزدان
ڕۆڵەی زانستیم ڕووبکەنە مەیدان
ئەوان بە بۆنی عیلمو مەعریفەت

---

(٢) نازانم شاعیر لە فۆلکلۆری وەرگرتووە، یا لەمەوە چووەتە ناو فۆلکلۆرەوە!!

(٣) داریدەکرد: درەخت ئەژیایەوە، چرۆی دەرئەکرد.

نیشتمـانەکـــەم بکـــەن بـە جـــــــــەننـەت
ئیـــــتر هـــەر بـــژی زانســـتیی کـــوردان
هـــەر ڕابەرمـــــــانبێ هیممـــەتی مـــەردان

## شینی شێخ عومەر*

دیســــان وا شــــیوەن کـــەوتە نـــــاومـــان
خـــەفەت جۆشـــئەدا دڵـــەی پڕ تــــــاومــان
چـــاو پـڕ لـــە گـــریان شـــیوەنی تـــۆیـــــە
(شـــێخ عـــومـــەر) ڕۆیـی شـــین و ڕۆڕۆیـــــە
هـــەر کـــەس بە خـــۆشــی وا لـــە ژیـــــاندا
کـــوردی بەدبەخـــتـیش وا لـــە گـــــریـاندا
شـــەرتە وەك فـەرهـاد، تـــا کــــاتی مـــــردن
نـــــابێ ســـاکـــنبێ ســــاتێ دڵـــی مـــن
ئیمـــڕۆ خـــــــــەمـناك و دڵ پڕ لـــەگـــــریان
بـــوو بە مـــیوانی گـــردەکـــەی ســـــــــەیوان
وا تەســـلیممـانکـــرد بە خــاك (شـــێخ عومەر)
نـــــاییبینینـــەوە تـــا ڕۆژی مـــــــەحشــــەر
مـــــردنی عـــــالم مـــەرگـــی عـــالـــەمـــە

---

* ژیان، ساڵی ۱۱، ژمارە ٤٨٢، ٦ی حوزەیرانی ۱۹۳٦.

شێخ عومەر: زانای مەزن و بەناوبانگ شێخ عومەری قەرەداخی، کوڕی شێخ ئەمینی قـەرەداخی، ۱۸۸٤ ــ ۱۹۳٦.

تـــــا شـــينيبكەين هێشـــتا هــــەر كـەمــە
ســـــەفــەر ئـــــــەڕۆيى قــەومــاندى خـــەتــەر
تاكـــــو گـــەياندى بـــە ئێمـــــــــــە زەرەر[1]
گشـــت ســــــــاڵێ فەلــــەك پاييــزو بەهـــــار
ئەشـــێ شـــــــاديمان بكــــاتە زەهــرى مــــار،
يــــا ڕەب بە حـــاجـەت مـوصطەفاى ســەروەر
ئـيـــتر نـەبيـنـــين زامــــــــى پــڕ خـــەتـــەر
بــــا دەســـــت هــــەڵــبڕين بۆ قــاپيى خـــــوا
بۆ ڕۆحـــــــــــى پاكــــــى (عـومـــەر) فــاتيحـــــا

[1] وا باوە كە مانگى (صەفەر ـ سەفەر)ى كۆچى توندو تيژو شوومە، بەڵام ميرزا عەبدولقادرى پاوە (١٨٣٤ ــ ١٩٠٧) لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نييە... ئەم توندوتيژييە ئەداتە پاڵ مانگى ڕەمەزان:

تونديى سەفەرێ مەنشوورى عامەن ڕەمەزان توندەن، سەفەر بەدنامەن

واتە، وا باوە كە مانگى سەفەر توندوتيژە، نەخێر ئەمە وانييە، ئەگەر ڕاستت ئەوێ، مانگى ڕەمەزان زۆر توندوتيژە، كەچى بە نارەوا سەفەر بەدناو كراوە، ئەم تاكە هۆنراوەيەم لە خوالێخۆشبوو حاجى خدرى ئاسنگەر ـ خەڵكى تەوێلە ـ وەرگرت، ناوبراو لەگەڵ يادو بيرى تيژا، تەمەنێكى زۆرى بەسەربرد (١٨٧٠ ــ ١٩٨١).

# هاتوچۆی جاف*

وا گـــــڕەی گـــەرمای هـــاوین هـــات، هــــــاوار
نـــەمــــــا گــوڵـــزاری بــــــاخـــی نـــــەوبــــەهــــــار
نــــەیهێشـــــت ســـــــەوزایی لـــــەشاخ و هـــــەردان
جــــــــاف پەرێشـــــــانن بۆ چــوونـــی کوێســــتان
ســــــــەبوون شـــەونمی نەهێشــــت لــــەڕووی چــڵ
بلــــــبل پەرێشـــــان، سـیسـبوو چیهرەی گـــوڵ[1]
مــــــــالآت ســــەرشــــێواو، هەمــوو دۆش دامــــان
خــێڵ گشـــــت خــولـئەخوا، وا لــــە مـــــــەریوان
شـــــــــــاخی (چـل چـــەمـــان) هـــەر ئینتیـــزارە
ئـــــــــــارەزوومـەندی دیــــــداری یــــــــــارە[2]
کـــــــــــوانێ ئێڵی جـــاف، ئیمســــــاڵ بۆ نەهات
دیســـــــــان بێچـــارە، چـــییان بەســــــــەرهات!!
دیســــــــــان کـــام فێڵـە بۆیـــــــــــان کـــــەوتە کار
خــــــۆیان هاویشـتە پەنـــــــــــای کــردگـــــــــــار!!
شـــــــــــــاخی (هۆبەتوو) هـــــــاوارییە، یەکســــــەر

---

* ژیان، ساڵی ١١، ژمارە ٤٨٧، ١٩ی تەمووزی ١٩٣٦.

(١) سەبوون: سەموون، سمووم: گڕەی کوشندە. چیهرە: ڕوخسار

(٢) چل چەمان: چل چەمە ــ شی پێنەڵێن ... کوێستانێکی بەرزو بڵندو فراوانە، کەوتۆتە میانەی مەریوانو دێواندەرەو سەقز.

نەهات (شاتری)و تیپی (تەڵ بەسەر)[٣]
بۆچ ڕێگەم بڕا، لە کێ پرسیار کەم
بە چی دەرمانی دڵەی زامارکەم!!
(کەلیخان) سۆزەی ئەگاتە (بانە)
ئەڵێ دڵسۆزم لە گەرمیانە[٤]
ئێستا خێڵی کورد وان لە شارەزوور
عاجزو خەمبار، پەشێوو ڕەنجوور
هەردەکەی دوجەیل جێی خێڵی لەیلە
مەجنوون دڵەکەی لە خەمدا کەیلە
(قەندیل)، هاواریە، کوا خۆشیی ساڵان!!
دەورم چۆڵبووە، کراوم تالان
وەرن، شاخەکان، با کۆمەڵبکەین
داد بەدامانی (شای شاخان) بدەین[٥]
ئەو دادمان سەرخا لە حەوت ئاسمان
تا پایەی عەرشی بڵندی ڕەحمان...
هاوارمان ئیتر بۆ تۆیە یەزدان
دوژمنی زانست بێبەشکەی لە گیان

---

[٣]هۆیەتوو: بانێکی بەرزو بەرینەو زۆر کوێستانە، کەوتۆتە نێوان سەقزو دێواندەرەو بیجاڕ.
شاتری: خێڵێکی ناوداری جافن. تەڵ بەسەر: سێ تەڵ بەسەر: پەلێکن لەهەمەوەند.
[٤]سۆزە: هاوارو ناڵەی دەروون.
[٥]شای شاخان: شاعیرمان پیرەمەگرون بەم ناوەشەوە ناوئەبات... لە هۆنراوەیەکیا، کە لە ژینی ژمارە ـــ ١٣١١ ـــ دا، ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٥٦، بڵاوکراوەتەوە، زۆرتر ئەمە ڕووندەکاتەوە:
خۆ پیرەمەگروون هاوبنهەوارە شەهنشای شاخە، بەرزیی دیارە

# پیری لە دێیە*

پیری لە دێیە، تووشم بوو ڕۆژێ
ڕوانیم فرمێسکی خوێن هەڵدەڕێژێ
وتی: ڕۆڵە من کۆنە بە بانم[1]
دواکەوتەی خێڵ و، وێڵی شاخانم
قەومم گیرۆدەی سوێنی درۆیە
بۆیە لە سینەم بانگی ڕۆڕۆیە[2]
پۆلێ کە ئەیبێ پۆلی خوێندەوار
ناگاتە ڕیزی گەلانی هۆشیار
وەك من میراتی فەرهاد وەرئەگرێ
ئاوارەی وەڵات، لە شاخان ئەمرێ
بیستوومە، هەیە مەکتەبی کچان
هەموو بخوێنن، سەرم فیداتان
دەخیلە، جوان، کە چوویتە ناوشار
بەسۆزی سینەم بۆم بکە هاوار
بڵێ، سەد ئامان عیلم بخوێنن
دەرسی زانستیی شەو مەفەوتێنن
ئەگەر هەڵکەوێ زانستیی ژنان
ئەویش زۆرباشە، بیهێننە مەیدان

---

* ژیان، ٤٨٨، ١٩٣٦.

(١) بەبە، بەبان: بابان.

(٢) سوێنی درۆ: مەبەستی لە بەڵێنو پەیمانی پڕ لە سوێندی درۆو دەلەسەیە.

# ڕۆژێ دیم*

ڕۆژێ دیــم وەتـــــەن زۆر بە خـــــــــەمناكی
پەرێشـــــانحاڵبووم، بۆ ســــــینەی چـاكی[1]
پرســـــــــــیم، ئەی وەتـەن بۆچ پەرێشـــانی
تۆ یادگـــــارو ســــــــــورمەی چـاومانی[2]

جــــــوابی وەتەن:

وتـــــــــی، بەســـــیەتی، ڕۆڵەی كـــــــوردانم
مــــــــــن پـەرەی زانســــت، دڵپەرێشـــانم[3]
دەخـــــــــیل بۆ مـەكتەب ڕوو لە خــــوێندنكەن
نەزانـــین بەســـــــــــبێ، ڕوو لە زانینكــــەن
قــــــــەدری زانستی بۆچـی نـــــــــازانن!
بــە زانســـــــــتەوە ئێـوە ئینســــــــــانن
مــــــــــــەكتەب بۆ ئێـــوە پێویسـتە كـوردان
ئــــــــەبێ پێـی بڵـــێین بەهەشـــــتی جیهان
گــــــــەر بێتو نەیكـــــەن بینـــای زانســــتتان
چــــــۆنتان لـــــــە ڕوو دێ پێم بڵـــــێن وەتەن!

---

* ژیان، ژمارە ٤٩١، ساڵی ١١، ١٩٣٦.

[1] سینەی چاكی: سنگی هەلاهەلای.

[2] سورمە: كل.

[3] پەرەی: بۆ.

ڕۆڵەی زانستیم، بێچووە شێرەکان
شەو لەناو خۆڵا هەوڵی عیلم ئەدەن[٤]
باشە وا هاوین گوزەراندەکەن
سێ مانگەی زستان چۆن تیاهەڵدەکەن!!
هێند زارم سووتا، وەتەنم دواند
جەوری زەلیلی خۆی بۆ من نواند

## بەخێرهاتن*

یاخوا بەخێربێن وزەرای عێراق
بێ بە ئیتیفاق، لابەرێ نیفاق[١]
چرای وەتەنمان بەئێوە ڕوونە
عیلمتان جۆری دەریای جەیحوونە
سەروەرمان ڕەشید عالی گەیلانی
بەڕاو تەدبیریا ئەرەستۆی ثاني
دوو زاتی تریان بە فەضل و ئەکا
وەتەن ئومێدی خێریان لێئەکا
تاکە، یەکێکیان، چرای خۆمانە

[٤]واتە قوتابیانی زانستی شەوان لە خانوویەکی کۆن و پڕ لەخۆڵ و تەپوتۆزدا ئەخوێنن.

*ژیان ، ٤٩٣، ٢٢ی ئاغستۆس، ١٩٣٦.

[١] ئیتیفاق: گونجان و تەبایی... نیفاق: دووبەرەکی و دووڕوویی.

وەك یەكن، وەحدەت ڕێی موسڵمانە
عێراق جامیعەی وەحدەتو مەطاف
وەحدەت ئەمانكا بەشێری مەصاف[2]
تەشریفیان هێنا بۆ سلێمانی
وەتەنمان بەرزبوو بە شادمانی
وەرن ئەی یاران، با صەف ببەستین
بچینە پێشواز سێ زاتی گوزین[3]
بەشادی بژین تا ئاخر زەمان
بلێن ئاصەفی مولكی سلێمان[4]
خوێندن پێویستە بۆ پیرو جوان
بگەنە فریای زانستیی كوردان
ئەمە حەوت مانگە مەعاش نەدراوە
(عالی)و (زەكی)یەتیی خۆتان بنوێنن
فریامانكەون، مەمانمرێنن[5]
دادی (بەنگینە) بۆ وەزیرەكان
فرە مەغدوورین، سەرم فیداتان[6]

---

[2] مەطاف: دەورو خول، كۆتایی گەشت. مەصاف: مەیدان ، كۆڕ... صەف ببەستین: ڕیزبین

[3] گوزین: بژاردەو ڕێزدار

[4] ئاصەف: وەزیری داناو بلیمەتی سلێمان پێغەمبەر (د. خ)

[5] عالی: بەرز، مەبەست ڕەشید عالییە.

زەكی: پاكو بێگەرد، مەبەست (ئەمین زەكی)یە، مێژوونووسی بەتوانای كورد، چەندجارێ لەوەزارەتەكانی عێراقدا هاوبەشیكردووەو زۆر خزمەتگوزار بووە.

[6] فرە مەغدوورین: مافمان زۆر خوراوە.

# زانست ژیایەوە*

حەوت مانگبوو، یاران، مەعاش نەدرابوو
ئومێدی ژینی زانست نەمابوو
لاوان پەرێشان، گشت دۆش دامابوو
طالعسیا بووین، چارە نەما بوو[1]
دەستمان هەڵبڕی ڕوو لە ئاسمان
وتمان فریاڕەس، خوای ئینسو جان[2]
ئینجا بە حاجەت غازییانی پاك
بە ئاه و ناڵەی ئەسیرانی خاك
بەشادی بژین وەزیران، سەربەست
کەوتنە فریای مەدرەسەی زانست
لوتفیانکرد، پارەی زانستییان دا
ڕۆحی لاوانی کورد ئینجا ژیا
ڕوحمی وەزیران دەنگیدایەوە
چرای زانستی هەڵکرایەوە
هەتاکو ماوین سوپاسیانئەکەین
سەرمان بەفیدای ئەساسیان ئەکەین
وەحدەتی عێراق زۆرچاك مەعلوومبوو[3]
ئیفتیرای خیلاف، فیکری مەوهوومبوو

---

* ژیان، ٤٩٤، ٢٩ی ئاغستۆس، ١٩٣٦.

(١) طالعسیا: بەدبەخت ، چارەڕەش.

(٢) فریاڕەس: ئەوکەسەی فریا ئەکەوێ    ئینس: مرۆڤ.    جان: جنۆکە.

(٣) وەحدەت: یەکێتی.    ئیفترای خیلاف: فاتوفیتو دووبەرەکی.    مەوهووم: پڕوپووچ.

# بەخێر بێیت*

بـــەخێربێیت فێنکی دڵەکەم، بـــــــای شـەماڵ
بـــــــــــا هەر کزەت بێ و بشەنێ دەسـماڵ[١]
تــــۆ وەخـت عـەسـری زەرد، یــــــا بەیانییان
عـــــــەتر ڕێزانکەن، هەردوو شـانبەشــــان[٢]
تـــــــۆ لابە ڕووبەند لە ڕووی نـەوخـــــــالان
بـــــا، تـۆ نەی گـــــۆنا بوا بە تـــــــــالان[٣]
تـــــــۆ پیاڵەی لەبڕێز بفـــڕێنە لە یـــــــــار
بــــــــا بێتە ڕیزی عاشقی هــــــــــەژار[٤]
شـــــــــەوەکیان هەوای باخی ســـــــەرچنار
گوڵ عـــــــــەتر بەخشـە، بلبلان خـــــــومار[٥]
تـــۆ بــــــــــــــەندی گـوارەی زێڕین بپسێنە
ئـەو تاقی ئەبرۆی گـرژکا بـــــــــــــــە کینە،
هـــــــــاوین ولاتمان جۆری بـــــــــــەهارە
جـــــێگـەی سـەیرانگای عاشق و یـــــــــــارە

---

* ژیان، ٤٩٦، ٢٦ی ئەیلوولی ١٩٣٦.

[١] دەسماڵ: سەرپۆش، پۆشین.

[٢] عەسری زەرد: زەردەپەڕ، دەمەو ئێوارە. عەتر ڕێزان: گوڵاوڕێژ، گوڵاویژان، پڕژاندن.

[٣] ڕووبەند: ڕووپۆش، پەچە. تۆنەی گۆنا: ئارەقی کولم. بوا: ببا.

[٤] لەبڕێز: لێواو لێو، لیپاو لیپ.

[٥] شەوەکیان: لەکاتی شەوا ، شەوانە. خومار: مەست.

ئاوی سەرچاوان ئەدرەوشێتەوە
تازە گوڵخونچەی ئەگەشێتەوە
نەمامی کۆرپەی تازە پێئەگا
دڵێ هەزار دڵ گرفتارئەکا
لەو بەرهەمهاتووە باخی بەکرەجۆ
ئەبێ بەسایە بۆ نیشتمان تۆ
قۆپیی قەرەداخ گەر بکەین بەقەسر
وڵات بەرز ئەبێ ئاوایی عەسر
پیرەگروون بێ بە جەبەل لوبنان
مەحجووب ئەمێنێ (باخ پاشا)ی تاران
بەندەم، (بەنگینە)، لاوی کوردستان
بژی زانستی و کۆمەڵی یاران

# هاوار بۆ زانست*

هـــــــــــاواری زانسـت ئــــــەووەڵ بـۆ خـودا
بــــۆ موتەسـەڕیف، خـوا یـــــــــاریەی بــــدا
ســـێهەم بۆ ڕەئیـس پــــــــــیری کـــەیخودا
هــــــەوڵی ســەربەسـتیی زانسـتی ئـــــــەدا[1]
ڕەشـەبای پــــــــــاییز هجـوومی هـــــاورد
خـەیمەی سـیایی لـــــــەدڵ بــــــــــەرپاکرد[2]
لای خـــــەڵك بــــــــــەتـەنها گـــــەلاڕێـزانە
ئێمــــــــــەش هـــانامان بــــــۆ جـەنابتــانە
ئێوە ئــــــــــــەفەرموون، زانسـت چـــــــاومانە
چـــــــاوی ئێشـاویش چـــــــــارەی دەرمانە
زانسـت ناگـونجێ لـەیـــــــــــــــــــانەی چـۆڵـدا
حـەیفە ئەســــــــــــیر بێ لەخـــــــاكو خـۆڵدا
ئێمــــــــــە ڕازیبووین بــــــــــــەتـۆزو غوبار
بــــــەلاَم وا ســــــەرما خســـتینیە هـــــــاوار
ئێمـــــــەو بـــــایەقوش هـەردوو هـــاودەردیـــن
کــــــــــەلاوەنشـین، هــەناســــــە ســــــــەردین
ئــــــــــــــەو ڕەنـگی ســــیا، وە ڕوخـسـارەوە

* ژیان، ٤٩٧، ٣ی ت ١، ١٩٣٦.

[1] ڕەئیس: سەرۆکی زانستی، بەڕێوەبەر، مەبەستی لەپیرەمێردە. کەیخودا: کوێخا، دەمڕاست.

[2] هجوومی هاورد: هێرشی هێنا. خەیمەی سیایی: ڕەشماڵ.

(بـــــــەنگینە)ش خـەمـناك، لـێو بـــــــە بارەوە
ئەمســـــاڵ بۆ زانســـت هـەر ســـــیا ســـــاڵبوو
لەپێشـــــــدا مـوفلـیس، دوایــی بێمـــــــاڵبوو
ئـێمـە لەزانســت قـــــــــــــورئان ئـــەخوێنین
پێویســتە هـــــــــــــــــاوار بــۆ گـەورە بێـنـین
دەپـــــــــــــــــارێینەوە لە گـەورەکـــانمـان
بـۆ چـــــــــارەسـەری زانستیـی کـــــــــوردان

# گردی سەیوان*

ڕۆژێ چووبوومە گردەکەی سەیوان
گۆڕخانەی بەرزی میللەتی کوردان
وتم سەلامبێ گەلی مردووان
ئەم گردە بەرزەی دووبنەی ئاسمان
مردن خۆشترە لە ڕەنجی جیهان
دواکەوتەو خەمبار کزو ناتەوان[1]
سەلام لەئێوەش ئەی شەهیدەکان
ئەی جگەرگۆشەی دایکی نیشتمان
عەترو ڕێحانەی گردەکەی سەیوان
ئاخر مەنزڵگای پادشای بابان
ئەووەڵ بارەگای خێوەت و سەیوان
بەرزتر لە پایەی هەیوانی کەیوان[2]
جێگا سەریری شەهریارەکان
ناوت مەشهوورە، گردی (ئافوان)[3]
لایەکت جێگەی شێخ مارفی نۆدێ
عەترو عەنبەرت دایم بۆمان دێ

---

*ژیان، ٤٩٨، ١٠ی ت١، ١٩٣٦.

[1] ڕەنجی جیهان: مەبەستی لەگێرمەو کێشەو ناسۆریی ژیانە.

[2] کەیوان: ئەستێرەی زوحەل، کەشکەلان.

[3] سەریر: ئارامگە. شەهریار: وەزیر. ئافوان: عافوان، گردی ناوەڕاست لە گۆڕستانی سەیوان.

لایەکت حاجی شـــــــــێخ ئەمینی خـــاڵ
کە دوعا گۆ بـــوو بۆ گــــەورەو مـــنداڵ[٤]
بـــــەرامبەر بـــــەتۆ گردەکەی یــــارە
جــــــێگای نەورۆزی کـوردان دیــــــارە
پــیاوی وا نـــــابێ وەك مامە یـــــــارە
دوای مردنیشـــی شـــوێنی دیـــــــارە[٥]
ئــــەم چەند فەردانەی (بــــەنگینە)ی هـەژار
پێـشـکەش بــــە ژیان بێــت بـۆ یـادگـــار[٦]

[٤] شێخ ئەمینی خاڵ: باوکی شێخ محەمەدی خاڵ.

[٥] سەروا دووبارەیە.

[٦] فەرد: تاکە هۆنراوە.

# میعراج*

شـــــەوی بیستو حەوت لەمـــانگی ڕەجـەب
میعـراجی (نـــــەبی)ی، قـوڕەیشـــی نەســەب
ئـــــەو شـەوە چووە لای ســــاحێبی خۆی
بـــــارەگای خوا جـــــوان ڕێـکخرا بۆی
ئـــەسپی (بـــوراق)یـــان پێدا بـــــەخەڵات
بـوو بــــــە سالاری ســـاحێب شـــــەفاعات
جـــــبریل ڕابەر بـــوو، چوو بـۆ ئاســــمان
ڕێی بیســـت هەزار ســـاڵ بۆی بـــوو بەیەك ئان[1]
بـــــــوراقو تاجیان دایە، بـــــــە خەڵات
ئیلهام بـــــە ئیلهام قــــورئانی بۆ هـــــات
ئەوسـا بـــــەڕاستی بـوو بـــــە پێغـەمەر
بـــوو بـــــــــەشەفـاخوای ڕۆژەکەی مەحشـەر
وەخـــــــــتێ لە ئاســــــمان کە گەڕایەوە
فــــەرموودەی (بـــــاری)ی گشـــت گـێڕایەوە
ئـــــــــەو یـــــارەی غـارە کـەوا صدديقـە
فـــــــــەرمووی میعـراجت لامـــان تەصدیقە
ئنجا ڕۆژ بـــــــــەڕۆژ ئیـسلام زیادبـــوو

---

*ژیان، ٤٩٩، ساڵی ١١، ١٩٣٦.

[1] ئان: چرکە.

بتخانه نەما، هەمووی وێرانبوو
حەزرەتی عومەر ڕوویکردە بیلال
فەرمووی بفەرموو بانگ لەسەر هیلال
بانگی محەممەد ئاشکرا خۆشە
نۆبەی غەزایە، دڵم بە جۆشە
عەلی ئەعلەمەو ئامۆزاو زاوا
نەوەی پێغەمبەر لەوەوە ماوە

## ماتەم و شین*

هەمدیسان ماتەم کەوتە وڵاتمان
لە دەست گەرمە شین نابێ نەجاتمان
باقوڕ بپێوین ڕیشسپی و لاوان
هیجرەتی فەرموو سەیید لەناومان
بە کۆمەڵ بڵێن هاوار خەتیب ڕۆ
لەبیب و ئەدیب شێخی نەجیب ڕۆ[1]
شەوقی بە شەوقی چرای دینمان ڕۆ
سەیید عەبدوڵڵای باخی ژینمان ڕۆ[2]

* ژیان، ژمارە ٥٠١، ساڵی ١١، ١٩٣٦.

[1] لەبیب: زیرەك، داناو بلیمەت.

خوتبەو سەدای خۆش سەر مینبەرمان ڕۆ
وارثی عیلمی پێغەمبەرمان ڕۆ
دەروێشان بگرین بە دڵەی خەمگین
بولبول گوڵی چوو، ئێمەش خونچەی دین
سۆفیان بناڵن بە بەرماڵەوە
سیا طالعان دەم بە ناڵەوە
حافظان جەمبن، بخوێنن قورئان[٣]
سۆزی سینەتان بگاتە یەزدان
دەبا بخرۆشێن مەلائیکەکان
بزانن شینە لەخاکی کوردان
زانستی، شەرقی بڵێن بە گریان
ڕۆژی ماتەمەو فەسڵی قورپێوان
بڵێن باوکەڕۆ، سیاچار خۆمان
هیجرەتی فەرموو خەتیب لە ناومان
(بەنگینە) بگری، چاو پڕ لە گریان
نزیکە سینەت ببێ بە بریان

---

[٢] سەیید عەبدوڵڵا: سەیید عەبدوڵڵای حاجی سەیید حەسەن، زانایەکی بەتواناو بلیمەتبوو، ئیمامو خەتیبی مزگەوتی گەورە بووە لەسلێمانی.

[٣] سیا طالعان: بەدبەختان ، چارەڕەشان.        حافظان: ئەو نابینایانەی قورئانی پیرۆزیان لەبەرە.
جەمبن: کۆببنەوە.
سۆزی سینەتان: قرچەی سنگی سوتاوتان.

# ماتەمو شین*

خوا داد لەدەست چەرخی کەچکەمان
بۆچ وا بە قینە لە پۆلی کوردان[1]
ئەمساڵ لەلای خۆی شەممو نەورۆز بوو
بۆچ طالعی کورد سیاو ئاڵۆز بوو
یەخەی توند گرتووین مەلەکی کەچباز
چەندی فڕاندین سالارو شەهباز[2]
بیکەن بە تەئریخ شوومییەکەی سی و شەش
گەورە مردن، بوو بۆ کوردان بەبەش
چاوی بەدکار بوو لێمان کەوتەکار
بوو بە تەعزیە بۆ کوردی هەژار
شیعری مەسرووری بڕا لە ناومان
بووە بە ڕۆڕۆ هاوارو بانگمان
نەوەی بەگزادان ئەحمەد بەگم ڕۆ
خاوەن قەڵەمو ساحێب چەکم ڕۆ
خاوەن دیوانو دیواخانم ڕۆ

---

*ژیان، ژمارە (٥٠٢)، ٢١ی مارت، ١٩٣٦.

شاعیر ئەم هۆنراوەیەی بۆ شینی شاعیری گەورەو بەتوانا (ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان) وتووە، (١٨٧٦ ـ ١٩٣٦).

[1] کەچکەمان: نالەبار.

[2] مەلەك: لێرەدا مەبەستی فریشتەی مەرگە، ئیزرائیل.

نەتەوەی کوردی ساحێبقڕانم ڕۆ
عاشقی وەتەن دڵخوێنینم ڕۆ
یەکە سوارچاکی خانەی ژینم ڕۆ
گەورەی کۆمەڵی شاعیرانم ڕۆ
(فیردەوسی)ی (ثانی)ی کوردستانم ڕۆ،[٤]
زانست بناڵە، بڵێ هاوارە
ئیتر شاعیری نەما لەم شارە
(بەنگینە) بڵێ، دنیای بێوەفا
هیچ کامت نەبوو بۆ ئەهلی صەفا

# نەشیدی زانستی*

سەرم فیداتان میللەتی کوردان
بگەنە فریای زانستییەکەتان
پێویستە خوێندن ئەمڕۆ بۆ کوردان
چونکە دواکەوتووین ئێمە لەگەلان
ئەبێ بە خوێندن بێینەوە مەیدان
ئاوەدانیکەین زانستیی کوردان
ئێمە کە لاوین تازە پێئەگەین

---

[٤] فیردەوسی: شاعیری بەرزو ناوداری ئێرانیو خاوەنی شانامە. ثانی: دووەم.

* ژیان، ٥٠٤، ساڵی ١١، ١٩٣٦.

خزمـەتی وەتـــــەن بـــــــــــە چـاومـان ئەکەین

چـونکـە زانـستی بـــــــــــــاخی مـــیللـــــەتە

جـــــێگـای ئـــــــــەخلاق و زەوق و لـــــــەززەتە

هـــــەر کوردێ قـــــەدری زانست نــــــــەزانــێ

ڕۆڵـــــــەڕۆ بکا بــــــــــــەچلـــەی زســتانێ[1]

چـــــونکی بـــــــــــــە زانست ڕۆڵە پێئــــــەگا

ڕوو لە خــــــوێندن و عـــــیلم و فــــــەن ئــــــەکا

شـەو بکـەن بـــــــــــەڕۆژ، بـــــــــــە دڵ بخوێنن

وەتـــــــــــــەن لە جەهـــل و نیـــفـــــاق دەربێنن

ئەوســـــــا نیشتمان زۆر بـــــــــــە ســـەربەستیی

ئــــــــەڵێ هــەربـــــــــــــــژی ڕۆڵەی زانســــــتی

---

[1] قەدر: نرخ و ڕێز.

# جەژنە پیرۆزە*

جەژنە پیرۆزەی دڵ، لە چاو و دەم
بۆ ئەوەی دەرچێ لەناو دڵان خەم
ئەڵێ موبارەك جەژنی ڕەمەزان
ڕۆژی عوشرەتە ئەمڕۆ بۆ باران[1]
عیدت موبارەك ئەی چاوی پڕ نوور
فەردا ئەبینین ڕۆڵەی زەردو سوور[2]
دەبینین وڵات بە شادمانی
ئەبینینەوە شای ئەردەڵانی!!
ئەبینین لاوی مەكتەبەكانمان
بە عیلمو فەنن و كردەوەی جوان
دێننەوە بەرچاو مەردی كوردستان
چلۆن ژیابوون بەبەو كەریم خان
بڕوانە باخی میللیی تازەمان
ئەڵێی جەننەتەو هاتووەتە جیهان[3]
بڕوانە لاوی سەربەستو سەرخۆش
سازو سەمتووریان هێناوەتە جۆش[4]

---

* ژیان، ٥٠٦، ساڵی ١١، ١٤ی ك ١، ١٩٣٦.

[1] موبارەك: پیرۆز. عوشرەت: كۆبوونەوەو پێكگەیشتنی نازداران.

[2] فەردا: سبەی زەردو سوور: ڕازاوە.

[3] باخی میللی: باخی گشتی لەسلێمانی. جەننەت: بەهەشت.

ساقی پەروانە خولئەخوا بەناز
بالاّ چوون نەمام چوو بە نیمە ناز
جەژنپیرۆزی ئەکا لەلاوان
ئەڵێ هەربژی لاو شەدەلاران[٥]
چاو ئەڵێ، ئەی دڵ خۆشە گوفتارت
خۆشە مژدانەی جەژنی ئەمساڵت
بەڵام ئەی تۆ وا داخ لە دەروونی
وەك من مەغدووریی وەتەن نابینی،
بە پارك و باخچەی میوەدارەوە
بە ئاوو هەوای وەك پۆلوارەوە[٦]
دڵ، مەگەر جادەی تازە ببینم
ئەوسا ساکنبێ ئەسەف و قینم[٧]

---

[٤] سەرخۆش: زۆر شادو دڵخۆش.

[٥] لاو شەدەلاران: ئەو لاوانەی سەرپێچو کلاّوو مشکییان بەلاری بەستووە، کە نیشانەی خۆشیو شادییە.

[٦] پارك: باخ.     پۆلوار: باخو سەیرانگەی هەردوو لای شەقامو نێوانی دوو شەقام.

[٧] ساکن: ئارام.     ئەسەف: داخو پەژارە.

# بۆ ژیان*

نامەی بەنگینە دیسان بۆ ژیان
بۆ پیرەمێردی دڵسۆزی کوردان
فیداتبم با بۆی پیری دڵسۆزمان
بە تۆ ڕۆشنە جەژن و نەورۆزمان
تەعطیلبوو زانست مانگی ڕەمەزان
وا جەژن ڕۆیی، هاتیتۆ مەیدان
لە ئێمە خوێندن، لە ئێوە هیممەت
بە عیلم وەتەن ئەبێ بە جەننەت[1]
خۆمان ڕسگارکەین لەدەس نەزانین
ئەوساکە بڵێین پۆلی ئینسانین
بڵندکەین پایەی خاکی عێراقمان
هەموو تێکۆشین بەدڵ و بەگیان
(حب الوطن) خۆ (من الایمان)
ئێمەش یەك دڵبین، ڕووبکەینە یەزدان[2]
وەتەنپەروەری کاری مەردانە

* ژیان، ٥٠٨، ساڵی ١٢، ١٩٣٧.

[1] هیممەت: هەوڵ و کۆشش.

[2] حب الوطن من الایمان: خۆشەویستیی نیشتمان لە ئیمانەوەیە... فەرموودەی پێغەمبەرە (د. خ)

ئێمەش ئومێدمان بە جەنابتانە
هەر لەئێستەوە بۆ جەژنی قوربان
بۆمان مەعلوومکە تەمسیلەکەمان[3]
کام ریوایەتێ بینووسنە ژیان
ئێمەش ئامادەین بە دیدەو گیان[4]

## بەفرە ساڵە*

سەردیی زستانو بەفرەکەی ئەمساڵ
چلۆن ساکنبێ دڵەی پڕ خەیاڵ
شەماڵ فیداتبم، ڕۆژێکەو ئەمڕۆ
زۆر ئینتیزارە کوردستان بۆ تۆ
بە بەفرو بارەش پاییز چووەسەر
ئێستاش زستانە، بەفر تا کەمەر
سەحراو کەژو کۆ جە بەفرا کەیلە
شەماڵ بە وێنەی لەیل بێمەیلە[1]
دەخیلتم، شەماڵ، بگە کوردستان
بگە بە فریای نەوتووڵنەمامان[2]

---

(3) دیارە بۆ جەژنەکان شانۆگەری ئامادکراوەو شاعیریشمان بەشداریکردووە.

(4) ڕیوایەت: چیرۆك.

* ژیان، ٥٠٩، ساڵی ١٢، ١٩٣٧.

(1) جە: لە

(2) نەوتووڵ: تازە تەرز، خەڵف ... نەوتووڵنەمامان: نازدارە باڵا نەمامەکان.

ئێستا پەشێون، مات و سەرگەردان
بە وێنەی مەجنوون، دڵ پڕ لە گریان
شەوێ لە ناکاو بدە بەسەردا
بەرگی دڵسۆزی بکە وە بەردا
گەلێ بێکەسان ئەسیری بەفرن
حەیوانیان قڕبوو، خۆیشیان وا ئەمرن
ئەهلی شارەکە بێنەواو هەژار
کەوتنە واوەیلا بۆ خەڵووزو دار
چوون تیپی سوپای شاهی ئەسکەندەر [٢]
بدە نەعرەتەی (الله اکبر)
شەماڵ ئاخ بۆ تۆو هەورەکەی باران
دڵتان ڕەنجاوە، هانامان بۆتان
شەماڵ بۆ خاتری شاهی مەدینە
هانای بۆ تۆیە شیعری (بەنگینە)

---

[٢] چوون: وەکو ، بەوێنەی شاهی ئەسکەندەر: ئەسکەندەری ذولقەرنەین.

# نەشئەی مەی*

بەنگینە بە مەی هاتۆتە زمان
نەشئەی سەرمەستی ئەبا بۆ (ژیان)[١]
ساقی بۆم تێکە پیاڵەیەك مەی
موطریب بۆم بڵێ لاوکێك، سا دەی[٢]
دەنگبەرزکەو بڵێ لاوك و حەیران
خۆشتر لە ڕاگەو دەستگای تاران
ئەوسا بە مەستی بە یادی (ژیان)
بڵێ هەر بژی زانستیی کوردان
چونکە لە وەتەن جەهلی دەرپەڕان
سەودای خوێندنی خستە ولاتمان
سالانی پێشوو ڕەفیقەکانمان
دەست بە کوتەکبوون هەموو ئێواران
ئەچوونە دەشتی پشت کانیی ئەسکان
سەرو گوێلاکی یەکیان ئەشکان[٣]

---

* ژیان، ٥١٠، ساڵی ١٢، ١٩٣٧.

[١] ژیان: مەبەست حەفتەنامەی ژیانە.

[٢] ساقی: مەیگێڕ.. موطریب، مطرب: گۆرانیبێژ

[٣] وێنەی گەلەکۆمەو شەڕە گەڕەکمان ئەخاتە بەرچاو... بەڕاستی داب و نەریتێکی سەرەڕۆیانەو کوشندەو نا پەسەندبووە.

بە عیلمی زانست ئەو شەڕە فەوتا
یەکدڵیی ڕێکخست لە ناو وڵاتا
ئێستا ئەبینین وێنەی ئەوروپا
ڕۆژ سنعەتئەکەن، شەو لە مەکتەبا
بە دەرس ئەیخوێنن ڕێی دین و دنیا
ساڵانی پێشوو میللەت چۆن ئەژیا!!
چوون مەستی بادەی لوتفی وەتەنبوون
دوو دڵی نەبوو، هەموو هەر دۆستبوون[٤]

## زستان ـ زەمهەریر*

نامەی بەنگینە بۆ خاوەنی ژیان
گەوهەر فرۆشی زانستی کوردان
باپیر دیسانۆ وادەی زستانە[١]
ئەمساڵ وڵاتمان وێنەی کوێستانە
ساڵی سی و حەوتی میلادی کە هات
بە جارێ ساردی کەوتە ناو وڵات
زۆر نەحسە، دیارە هەوای ئاسمان
شەو بەفر ئەبارێ و بە ڕۆژیش باران[٢]

---

[٤]چوون: چونکە، لەبەرئەوەی.
بادە: مەی ... سەروا دووبارەیە.
*ژیان، ٥١٢، ای شوبات ١٩٣٧.
زەمهەریر: تۆف و باو بۆران، زریان.
[١] وادەی: کاتی، وەرزی.

وەختێ هاوارم کە کردە شەماڵ
ئاگری تێبەردا بوو بە کۆی زوخاڵ
ئەوسا کە گۆیژە لووت بەرەو ژوور بوو
دەشتو کەژو کێو وەك دیجلە سوور بوو
بەڵام ئێستاکە زۆری سەند چلە
خۆیو چلوولەی وا چلو ملە
کە، چلە پیربوو، پشکۆ ئەکەوێ
زستان بە جارێ سەری ئەنەوێ
خالۆ ، زەمهەریر کە دێ شینئەکا
ئەویش دە ڕۆژێ شەڕ بەقین ئەکا
کە ئەو ڕۆیی دێت بورجی پیرێژن
چۆن هەڵدەسووڕێ بە وێنەی دوژمن
وەلحاسڵ، برا، زستان زۆر سەردە
تا شەوی نەورۆز پڕ جەفا و دەردە[٣]
هەتا ئەو ڕۆژەی نەورۆزی کوردان
ئاگری (پیرەمێرد) ئەگرێ بۆ ژیان
ئەمجا بەهارە، هەر بژی یاران
ڕووبکەینە سەحرا بە دڵو بە گیان[٤]

---

[٢] نەحسە: نا لەبارە.

[٣] وەلحاسڵ: سەرەنجام، بەکورتی.

[٤] سەحرا: دەشتودەر، سەیرانگە .

# تەمسیل*

تەمسیلیان ڕێکخست بۆ جەژنی قوربان
دوو مەوضوع هەردوو نایاب و جوان[1]
یەکێ تەمسیلی مەحموود ئاغای سیوەیل
دووەم فەقێ ئەحمەد ئەستێرەی سیوەیل[2]
ئەو فەقێ ئەحمەدەی لە (دارەشمانە)
هەڵکەوت و باوکی هەموو بابانە
ناوی (مەردی) بوو لە کوردستاندا
هونەریان نواند لە مەریواندا
حوکمی ڕەوا بوو بەگزادەو سوار
دوژمن لەترسیان شەو نەیبوو قەرار
مەحموود ئاغا گەورەی دێی (شیوەکەڵ) بوو
لە ڕۆژی شەڕدا وەك شێری نەڕ بوو
هەیکەلی مەردیی ئەو دوو کوردانە
وا خوا ڕێکیخست بۆ ئەم قوربانە
ئەوسا بەمەردی، کوردان وا ئەژیان
دایم خەریکبوون بە دڵ و بە گیان،...

---

*ژیان، ٥١٢، ساڵی ١٢، ٨ی شوبات، ١٩٣٧.

[1] مەوضوع: بابەت.

[2] مەحموود ئاغای: بۆ کێشی هۆنراوە پیتی (د) ناگوترێ. سەروا: دووبارەیە.

پیرەمێرد خۆشبێ، گشت ڕۆژی جەژنان
تەمثیلێ ئەکەین زۆر نایاب و جوان
فەرموو ببینن کردەوەی کوردان
ئەوسا تێئەگەن ئەوان چۆن ئەژیان

## جەژن*

مژدەبێ وەتەن، جەژنی قوربانە
وەختی سەربەرزیی قەومی کوردانە
فەسڵێکە سەرماو جەفا کەمئەبێ
کورد، وەك حەج، تێکەڵ بە عالەم ئەبێ[1]
ڕۆژێکە مژدەی بەهاری پێیە
دڵ چاوەڕێی خەیڵ خاڵی لەیلێیە
لەیل بەلەنجەولار بێت بۆ تەماشا
لەناو مانا بێ، نەڕوا لە پاشا
وەختێ کە بڵێن زستان وا ئەڕوا
تا ساڵێکی تر ناگەڕێتە دوا
ئنجا زەردو سوور ئەچن بۆ سەیران
وێنەی ڕەوێڵەی ئاهووی گەرمیان[2]

---

* ژیان، ٥١٤، ساڵی ١٢، ١٥ی شوباتی ١٩٣٧.

(1) فەسڵێکە: وەرزێکە. جەفا: ناخۆشی ، چەرمەسەری.

(2) ڕەوێڵەی ئاهوو: ڕەوە ئاسك.

ئەمڕۆ کە جەژنی قوربانە، ژیان
مەشهوورە ناوی بە عیدی قوربان،
بڕواننە گۆیژە، چەندە بێگەردە
ئەڵێی مینایە، دەرمانی دەردە،
لای من چەند خۆشە جەژنەکەی یاران
ئیتر هەر بژی زانستیی کوردان

## هەر بەرزبێ*

هەر بەرز بێ، وەتەن پایەت وە شادی
نەغمەی بولبولت، شەوقی ئازادی[1]
چوار فەسڵت بەهار، گوڵی بێخارە
لەسەر زەمیندا بەرزیت دیارە[2]
وەسفی خۆشیی تۆ قەت نابێ تەواو
پڕ گوڵو نەسرین، عەرعەرو لاولاو
کەوت ئەخوێنێ لەبەرزی و نزار
بە نەشئەی دەڵێ منم خۆشگوفتار[3]
منم سەربالم کردووە بە لانە
دوورم لەقەڕەی قەلی بێگانە

---

*ژیان، ٥١٥، ساڵی ١٢، ٢٢ی شوباتی ١٩٣٧.
[1] نەغمە: ئاواز.
[2] بێخار: بێدڕک.
[3] نەشئە: جۆش و خۆشی. خۆشگوفتار: دەنگخۆش.

وەتەنپەروەریی من لە کیوانە
هەر من دەزانم خاکت چەند جوانە
پۆڕ بە کناچە، کناچەی حەزین
دەڵێ، نیشتمان، بێتۆ چۆن دەژین[٤]
من کە پۆڕێکم خاڵو مێڵ نەخشین
لەخۆشیی وەتەن دەمبە پێکەنین
ئاخۆ قازگەلی دەشتی مەریوان
چاو وێنەی تەڵا، گەردن ئەرخەوان[٥]
تاکەی حەسرەتمەند ئەم خاکە پاکەن
تەماداری ئەم هەڵکردە چاکەن!![٦]

---

[٤] کناچە: خوێندنی پۆڕ.

[٥] قازگەل: پۆلی قازو قزلنگ. تەڵا: زێڕ، ئاڵتوون.

[٦] تەمادار: بەتەمای. حەسرەتمەند: خەمبارو دڵتەنگ.

# جەژنبوو *

جـــــەژنبوو ئێمەش چـووبـووین بـــۆ گـــــەڕان
دیمـان هـــەر لایە، وا ســازەو ســــــــــەیران
پـۆل پـۆل قـــــــــــەد بـــاریك پـۆڕو كەوم دی
ئـــــــــــاخ، یاران خەوم ئـــــــــەوا هاتە دی
ئیمشـەو لـە خەوما مــــــــــن ئـــەم جەژنەم دی
عــــــــــــالەم دڵشادبوو، خــۆم خـەمناك دی[1]
ئێمە خـــــــەمناكو ئـەوان بـــــــــــــە شـادی
كـەوتە پــــــــــیرمەنصـوور ڕۆژی ئـــــــازادی
لایـــــــــــــــــە هــــەڵپەڕكێو دەســـتلە ملانە
لە لایـــــــــــــە خەندەی دیدە مـــــــــەستانە
بــــوو بــــووە ئاسمان، جێی چەرخو فــــــەلەك
هــــــاتبووە سـەیری، فریشـــــتەو مــــــــــەلەك
خۆ كـــورسی كـــورسی وێنـەی پـــــــــــەروانە
ئەسووڕایەوە بـــــــــــــە بـــــــــــای لـەرزانە
جەژن كــــــــەوتبووە شـەخسی پـــــیر مەنصوور
پـــــــــڕ لە بـالاّ بـــــــەرز، كەوا سەوزو ســوور
پــیر مەنصوور بــــــەكەیف، پــیری ئێمەش هـــات
نـــــــەمزانی چیبوو، چیمان بـــــــــەسەر هـات!!

---

*ژیان، ٥١٦، ای مایسی ١٩٣٧.

[1]سێ جار وشەی (دی) بە هەمان واتا هاتووە.

وێنەی گوڵاڵەی دەوری کانیبا
ئەشنایەوە سەرپۆش و عەبا
بەهار بۆ سەوز بێ گوڵ و گەزیزە؟!
چونکو دڵەکەم وا زویرو زیزە...

## مژدەی بەهار*

مژدەبێ بلبل، وەختی بەهارە
عالەم بۆ دەنگت زۆر ئینتیزارە
تۆ بەسەر گوڵا دایم ئەناڵی
بە وێنەی قەقنەس سیا زوخاڵی[1]
سینە سووتاوی بۆ عەتری گوڵێ
دایم خەریکی ئەم چڵەو چڵێ
ئەوا بەهار هات سەربەست بخوێنە
نەغمەی داوودی خۆت زوو بنوێنە،
سەیری چەند خۆشە باخی سەرچنار
بە نەغمە بڵێ، یا خوا بێت بەشار[2]
بلبل بەهارت بوو بەدوو بەهار

---

*ژیان، ٥١٧، ساڵی ١٢، ٨ی مارتی ١٩٣٧.

[1] قەقنەس: پەلەوەرێکی ئەفسانەییە، گوایا لە کۆتایی تەمەنیا گڕ لەخۆی بەرئەداو ئەبێ بە خەڵووز.
سیا زوخاڵ: خەڵووزی ڕەش.

[2] ئاواتی شاعیر هاتۆتە دی‌و، دەمێکە سەرچنار بووە بە شارو بەشێکە لەسلێمانی.

شەقامی شاریان کردووە بە گوڵزار
تەماشای باخچەی ڕێگاکەی کەرکووك
ڕازاوەتەوە جۆری تارای بووك،[٣]
ئیتر بەهاری ئێمە پیرنابێ
وڵاتمان دیلی نەزانین نابێ
بلبل بە لەنجەو دەمبەپێکەنین
بە چریکەو ناز، بە بەزمی شیرین
دەسا بخوێنە لە باخچەی نادی
بڵێ (بەنگینە) جەژنی جەفای دی
ئیتر هومێدم هەیە بە یەزدان
بە شادی بژی زانستیی کوردان

## نەورۆز*

هیوای بەنگینە بۆ خاوەند ژیان
فەخری زانستیی وەتەنی کوردان
تەمەننا ئەکەین ئێمە لە یەزدان
نەکوژێتەوە چرای نیشتمان[١]
هەمیشە دەشتی پڕ لە گوڵزاربێ

---

[٣]ئێستا ناوی شەقامی (مەولەوی)یە.
*ژیان، ٥١٩، ساڵی ١٢، ٢٢ی مارت ١٩٣٧.
[١]تەمەننا ئەکەین: هیوادارین، ئەخوازین.

بـــــــــه وێنـەی بـــــــەهـەشت گشـــت لالـەزار بێ
دایم لاوانـی ســــــــــــەربەست و هوشـــــــــــیار
نــــــــاوی خوێندنیان بــــــــــــڕوا شارەو شـار
گشـت ســـــاڵێ جـارێ هـەر بــــــــــەم قـــــەرارە
کـــــــۆمەڵ ببەســـــتن لـە گـردی یـــــــــــــارە[۲]
بیکـەین بـــــــــــــــــه عادەت جـەژنەکەی نەورۆز
بســـــــووتێ ئـــــــــــــــاگــــر بۆ هـۆزی دڵسۆز
دەهـــــــــــۆڵ و زوڕنـا و (شـــــەرقی)ی زانســـــــتی
بخـاتە نـــــــــــــــاو گەل ئـــــــــــاوازەی هـەستی
ســــــــــــــەماوەری زەرد، بێتە جۆش یـــــــەکسەر
چـــــــــــا بخورێتەوە، وەك لەعلی دوڵــــــــبەر[۳]
ئــــــــــاگری نـــــــــەورۆز بســــــــووتێ تــــــــا ڕۆژ
لەسـەر گۆڕەکەی یـــــــــــــــــــــارەی شـــــێرکرۆژ
بلێ هـەر بـــــــــــــــــــژین لاوانی پـــــــــــڕ هـۆش
تـــــــــــــــاکو گشت ســـالێ دڵیـــــــان بێتە جۆش

[۲] بەم قەرارە: بەمچەشنە.
[۳] لەعل: لەبەردە گرانبەهاو بەنرخەکانە، ڕەنگێکی زۆر ئاڵو گەشی هەیە.
لەعلی دوڵبەر: مەبەستی لێوی ئاڵی لەعلئاسای نازداری دڵبەرو دڵڕفێنە.

## زانستی *

زانستی سەلام لە (سەلام) ئەکا
نەورۆز پیرۆزی بە جەم جام ئەکا[1]
پێکمانەوەبێ بە دڵێکی شاد
کارتی نەورۆزت دەرناچێ لە یاد

## پاڕانەوە بۆ باران *

هانای بەنگینە بۆ هەوری باران
باران دەرمانە وەختی بەهاران
ساڵان بە باران سەحرا ئەبوو سەوز
پڕ لە گوڵاڵە، چەشنی قەنەوز[1]
ئێستا بەهارمان بووە بەپاییز
ڕەنگزەردو زەعیف، وەك دووریی ئازیز
فەلاح ماڵوێران، ڕوو لە ئاسمان
بۆ گرمەی هەورو نمنمەی باران

---

* ژیان، ٥٢٠، ساڵی ١٢، ٢٩ی مارت ١٩٣٧.

[1] (سەلام)ی دووەم: مەبەست مامۆستا شێخ سەلامی شاعیرە، (١٨٩٢ ــ ١٩٥٩)، لەو سەردەمەدا لە باکووری ئێراق فەرمانبەر بووە.

* ژیان، ٥٢١، ساڵی ١٢، ٥ی نیسانی ١٩٣٧.

[1] قەنەوز: قوماشێکی ڕەنگین و جوانبووە.

خوایە تۆ ڕەحمێ بکەی بە حەیوان
بارەیان ئەڕوا بۆ حەوت ئاسمان
بە بەفری زستان زوو قڕیان تێکەوت
بەهار لەبرسا دڵیان نەسرەوت
ڕۆژ تا ئێوارە شین و گریانە
بۆ هەوری باران سینە بریانە
بەعزێ بەگریان بۆ گردی سەیوان
ئەپاڕێنەوە لە زاتی یەزدان
ژنی بێچارە، دەستووری جاران
گاگەل دەفرێنن لە دێ بۆ شاران[٢]
یارەب بە حاجەت (مصطەفای ئەمین)
ئیتر بارانێ بۆ ڕووی سەر زەمین
خوایە بۆ خاتری سی جزمەی قورئان
ئیتر بیکەیتە ڕەهێڵەو باران
لافاو بێتە خوار لەسەر کۆساران
تاکو زانستی بچێتە سەیران

---

[٢] لەبەر بێبارانی لەوەڕ نەبووەو، خاوەن گاگەل، گاگەلیان داوەتەبەر بۆ شار و بەنرخێکی هەرزان فرۆشتوویانە.

# پەروانە وێڵەی*

پەروانە وێڵەی شەو لە دەوری شەم
بە شەوق و نووری ئەبێ خاتر جەم[1]
زۆر بێپەروایە لەتینی ئاگر
ئەڵێ با دنیا لە من بێ ئاخر
من بە عەشقی شەم ئەگەر نەسووتێم
هەموو شێوەیە حەرام ئەبێ لێم
شەم بێوەفایە، ئەمە نازانێ
هەڵیئەپڕوزێنێ، هەروا بە ئانێ
بڕوانە، شەمین بۆ زانستیمان
بەشکم دڵشاد بێ خاکی نیشتمان
سنعەت و خوێندن بکەین بە مایە
توو خوا وەتەنمان زۆر لە دوایە
هەندێکیان دەڵێن چەرخ بێوەفایە
سبەینێ حەشری دیوانی خوایە،
بەڵێ، خۆ ڕاستە، مەعلوومە وایە
ڕۆژی قیامەت دیوانی خوایە
بەڵام خزمەتی وەتەن پێویستە
وەتەنپەروەری دائیم دروستە

---

* ژیان، ٥٢٢، ١٨ی نیسانی ١٩٣٧.

[1] شەم: مۆم. ئەبێ خاتر جەم: بێخەمئەبێ، دڵنیا ئەبێ.

چونکە وتراوە (حب الوطن)
باوەڕمان هەیە ئێمەش عەلەنی
باوك، بڕوانە ئەسووتێ بەگڕ
ئێمەش بۆ وڵات ئەکۆشین وەك کوڕ[2]
چونکە بێخوێندن گەل پێشناکەوێ
میللەتی جاهیل شانی ئەنەوێ[3]

## مژدەی باران*

مژدەبێ وەتەن، وا باران باری
لاچوو لەڕووی تۆ شیوەن‌و زاری
ئیتر شاخ‌و کێو یەکجار شیرینە
دەنگی بلبلت لەسەر نەسرینە
بەهاری پیرت، عومری جوانە
ئەمڕۆ بەڕاستی جەژنی کوردانە
نەغمەی ڕیشۆڵەت لە هەزار نەزمە
خۆ قاسپەی کەوت لە هەزار بەزمە
خۆ شارەزوورت خەرمانی گوڵە
پڕ لە گوڵاڵەو دەنگی بڵبڵە

[2]باوك: مەبەستی لە پیرەمێردی نەمرە.
[3]جاهیل: نەزان، نەخوێندەوار.
*ژیان، ساڵی ١٢، ژمارە ٥٢٣، ٢٦ی نیسانی ١٩٣٧.

ئێجگـــــار شـــــارباژێڕ، خـــــۆشئاوو هـــەوا
ئـــــــەڵێی بەهەشـــــتە جێی ســــەیرانگـای وا
خۆ (تـــــــــــاریدە)ت مەوســـــــمی خۆشـــــی
پـــــڕ لە گـــولاڵەو، وێنەی بــــــــەهەشتی[1]
زەڵم و تــــــــــــانجەرۆت گـــــوڵ و گـــــوڵزارە
جــــێگای ســـــەیرانگای پـــیری هـــوشیارە
لانــــــــەی شـــــێرانت قۆپیی قـــــــــەرەداخ
پـــــڕ لەوەنەوشەو شـــــەوبۆو گـــوڵە بـــــاخ
خـــــــزمـەتتئەکـەین بـــــــە دڵ و بـــــــە گیان
چـــــــەشنی بــــــــەهەشتی بۆ گەلی کـــوردان
بـــــەڵام بـــــــە شەرتێ بین بــــــە خوێندەوار
لەشکری جـــــەهل دەرکــــــــەین لەنـــــاو شار

## حەکیم، بێحاڵم*

حـــــــــــەکیم، بێحاڵم، بگەرە فـــــــــــــریام
لەخـــــــەو بـــــــێزارم مــــات و بـــــــــەتەنهام[1]
شــــــــێوەم شـــــــــێواوە، لە دووریی لەیلام
پـــــــــــەروانە صیفەت، هاوڕازی چــــــــرام[2]

---

[1] تاریدەر: شاخێکی زۆر بەرزو کوێستانە، کەوتۆتە ڕۆژئاوای پێنجوێن.

* ژیان، ٥٢٤، ٣ی مایسی، ١٩٣٧.

[1] حەکیم: پزیشک، دانا.

شـــــــەو تـــا بـــــــەیانی ئاهـ و نــــاڵـەمـە
بێســـــاقیو بێمەی، بـــــــــــــــەبێپیـــاڵـەمـە
ئـــــاخ، شـەوی بــــــەهار لێم بووە بــــــە پاییز
خـەفـەتی بینــــای زانسـتیی ئـــــــــــــــــازیز
ئێمـەش نـــــــــــــــازانین گـــــوناهمان چـییە
بـــــــــــــــــۆچ هــــــاوارکـەرێ بـۆ ئێمـە نـییە!
تــوو خـوا زانســــــتی جێی ئومـێدمـــــــــــانە
چــــــــــــــــــــــرای لاوانـی نیشـــــــــتمانمانە
پـــــــــاڕانەوەمان ئـــــــەووەڵ لـە یـــــــــــەزدان
دووهــــــەم لـە گـەورەو لە کـــــــــاربەدەســـــتان
دەك دەخیلتانبـــم، حـــــــــــــــــاڵم بێحاڵــــــە
نــــــۆبەی بینــــایـە، ئــــــــەووەڵی ســـــاڵە
دەترسـم دیســـــــــــــان بکـەوێتـە زســـــــــتان
بکـەوێتە بـــــــــــــەر ڕەشـەباو بـــــــــاران!!
تــــاکەی دانیشـــــــین وا بـــــــــــــە ڕەزالـەت
یەخـــــــەگـیر (ئـــــــــــەبین) ڕۆژی قـــــــیامەت
شــــــەو لە زانسـتی قــــــورئان ئـــــــەخوێنین
هەناسـەی ســــــــــــــــاردی بۆ خـوا هـەڵدێنین

---

(٢) پەروانە صیفەت: پەروانە ئاسا ، وەکو پەروانە (پەپوولە).

# شەقامی تازە*

بناغەی جادەی وەتەن دانرا
مژدە بۆ پۆلی هاوخوێن و برا
خۆشی و بەشارەت کەوتە نیشتمان
بۆ بەرزیی وڵات، خاکی کوردستان
تۆوی خوێندنی زانستی ڕووا
تەرزەی نەزانین بەسیەتی تووخوا!!
دەرسی تەئریخی کورد بکەنە بەر
قەڵەم هەڵگرین لەجیاتی خەنجەر
دوو ڕوویی و نیفاق ئیتر نەمێنێ
میللەت یەکدڵبێ، ئەوسا ئەنوێنێ
تەمەڵی بەسیە، مەچنە چایخانە
عالەم پێشکەوتوون، کورد چاوەڕوانە
بڕواننە هیتلەر داهیەی ئەڵمان
بە عیلم و صنعەت عالەمی ترسان[1]
تەماشای قەومی ئینگلیزکەن پێشکەوت
سەنجوقی بەرزی لە عالەم دەرکەوت[2]
تەماشای شەرق و غەربی دنیاکەن

---

* ژیان، ژمارە ٥٢٦، ١٧ی مایسی ١٩٣٧.

[1] داهیە: زۆرزان — عیلمو صەنعەت: زانستو پیشەسازی.

[2] سەنجوق: ئاڵا

ئەوســـــا بۆ خـوێندن ڕۆحــــتان فیداکـــەن
خـــــەڵکە بــــا وەکـوو قەومان بنـــوێنـین
لە دراوســــیمان بــــــــەجـــێنەمێنین
نـــــــەڵێن دواکـەتوو قـــەت پێشناکـــەوێ
بــــە قووەی خــــوێندن جەهلیش ئـــەنەوێ
کە جــــەهل نـــــــەما، ئەوسـا بـــــــڕوانە
ئـــــەستێرەی ڕوونت وا لـە ئـــــــاسمانە

## یانەسیب*

بـــــــەیانامـەکەی خـاکـی کـــــــوردستان
یادگـارەکـەی بـــــەبــــەو کـــــەریم خـــان
پـــــــیری دڵســـۆزمان، مـودیری ژیـــــان
فــــــەخری قـــــوتابیی زانسـتیی کـــوردان
بـۆمان بنـووسە ئــــــەم چەند فـــــەردانە
واتـــــــەی زانسـتیی قـەومی کـــــوردانە
بلــــیتمان کـــــڕی بــــــە پارەی ژیـــــان
خســــتمانە بــــەختی زانســــتی کــــوردان
بـــــــەشکم شـــانسمان یــــاریدەبدا
ئـــــــەم پـارە دەرچـێ، بیکەین بــــــە بینا

*ژیان، ٥٢٧، ٢٤ی مایسی ١٩٣٧.

فەلاح ئەگەڕێن بۆ ئاوی بەحر
ئەگەر بۆی دەرچوو، ئەڵێن خوا شوكر
بەناوی هەموو قوتابییەكان
دەرچێ، بفەرموو، پیری دڵجوان
بەختی جەمعیەت بخەرە كایە
بۆ ئەم بانقۆیەی وا لە بەغدایە[1]
یا وەك قومارچی ئێمەش بێدینین
یا لە یانسیب پاروو ئەفڕێنین
غولامی لاوان (بەنگینە)ی هەژار
ئومێدەوارە لای پەروەردگار
چل و پێنج هەزار، شەش سەدو یازدە
جائیزەی گەورە بۆ ئێمە سازدە[2]
پێنجسەدو حەفتاو یەك و سی هەزار
بەختی زانستی بۆمان بێتە كار[3]

---

[1] جەمعیەت: مەبەست لەكۆمەڵی زانستییە. بانقۆ: بانكنۆوت ... بانكەنەوت، بانقە نەوتیشی پێگوتراوە. هەمووشیان بەواتای چەكی بانك.

[2] - [3] ژمارەكان ڕەنووسی بلیتی بەختن.

# گۆرانی*

لەشکری هاوین بە تۆزو غوبار
هاتە سەر باخی ڕەنگینی بەهار
نەمابوو چەمەن، گوڵ عەتری نەما
بلبل چوون فەرهاد غەرقە لە خەما[1]
هەناسەی ساردی هەڵکێشا بڵبڵ
با هەر بناڵم بۆ دیداری گوڵ
چیخ و چادری جاف گەیشتە بان
گەییە هەوارگە لە شلێرو ناوخوان[2]
بلبل بە ناڵە بۆ باخ و بێستان
ڕێی کوێستانیان گرت پۆلی چاومەستان
ئەوسا خێڵ بەزی لە شانی شلێر
بڕوانە لاوی سواری دەنگدلێر[3]
دەنگی تەپڵی باز، هەوای سالاری
لێئەدەن سوارەی لاوی کۆچەری[4]

---

* ژیان، ٥٣١، ٢١ی حوزەیرانی ١٩٣٧.

(١) چەمەن: چیمەن، مەبەستی لە سەوزایی کێوو دەشتو دەرە. عەتر: گوڵاو. غەرقە: نوقمە.

(٢) جاف: خێڵی گەورەی جاف. بان: سەروو، بەرزایی، واتە کێوو شاخ.

شلێرو ناوخوان: ناوچەیەکی سازگارو کوێستانە، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی پێنجوێن.

(٣) بەزی: باری خست و پشوویدا. شان: لاپاڵو لاشانی شاخ.

(٤) دەنگی تەپڵی باز: ئاماژەیە بۆ تەپڵڵێدانی جاف لە کاتی شکارو کۆچکردندا.

هەوای سالاری: ئاوازی سەردارو پێشڕەوی بە تواناو خاوەن سامان، جۆرێکە لە تەپڵڵێدان.

بلـــــبـــل تـۆ لـەكـــوێ ئەبینـــی ســـــوار!!
ئـــــاهـ و ناڵـــــە بكـە بۆ خۆشیی بــــەهـــار
تــۆش وەك (بـــــەنگینە) ســــینەت بــــریانە
بـۆ بێبیناپـــــی ئــــــەم كـــورگـــــــەلانە[٥]

## سوئالو جواب*

س:

مـەجنوون بــــــــە ناڵـــــە ڕوویكـــــردە لەیلـــێ
وتــــی غــــەمگینە دڵـی مـــــــــن، خــــــەیلـێ
وێڵبم لـە هــــــەردان تـــــــــــۆم لە خـــەیــاڵە
بـۆچاوی كاڵت مــــــــــــن ئەكـەم نــــــــــاڵە
مەجنوونی دنیـــــــــــــام، مەجنوونـی دەروێش
شــــــەیدای بــــالاتم ســـەد حـــاشـا لە خوێش[١]
بـۆچـــیمـە تـــــــــاجی شاهـی فـــــــەرەیدوون!
بـــــــا بڵــێن شـێتە لە كـێوان مـــــــەجنوون!!
بــــــــــــەڵێ هەی لەیلێی، بێمەیلو گــــــفتار
مـــــــــــن عـاشقی تـــۆم شــــێتو بێقـەرار

---

[٥]بێبینایی: دیارنەبوون و نەدیتن.

*ژیان، ٥٣٢، ساڵی ١٢، ٥ی تەموزی ١٩٣٧. سوئالو جواب: پرسیارو وەڵام. س: پرسیار

[١]خوێش: خزمو كەس.

ج:

لەیل بەنیونیگا هەڵیهێنا چاو

وتی فیداتبم قەیسەکەی خۆشناو[٢]

مەڵێ من قەیسم، وێڵم لە هەردان

من لەتۆ زیاتر بوومە سەرگەردان

خواردنم بێتۆ وەك زەهری ماره

چوونی کوێستانم لا قەبری تاره[٣]

بەهار لەسەیری هەوارگەی لەیلاخ

شیوەنە کارم، دەروون پڕ لە داخ[٤]

هەر چاوەڕوانم لە دەشت و سارا

بەشکم ببینم مەجنوونی هامڕا[٥]

مەجنوون، شای نۆفڵ دڵسۆز بوو بۆ تۆ

لەشکرکەشیکرد لە دەشت و لە کۆ[٦]

بوۆچ، پاڕایتەوە، ڕووتکردە ئاسمان!

هەناسەی تۆ بوو نۆفڵی شکان!

---

[٢]نیونیگا: گۆشەی چاو، تیلەی چاو. ج: وەڵام

[٣]قەبری تار: گۆڕی تاریك.

[٤]لەیلاخ: کوێستان.

[٥]هامڕا: هاودەرد، هاوڕاز، هاوڕێ.

[٦]شای نۆفڵ: سەردارو سەرۆکی هۆزێکی ناوداری عەرەببووە، ویستوویەتی لەیلا بخوازێ بۆ مەجنوون.
لەشکرکەشی: کۆکردنەوەو ئامادەکردنی لەشکر بۆ جەنگ. کۆ: کێو.

ج:

مــــــــــــهجنوون كـوردانه هاتهوه زوبـــــــان
وتـــــــــى فـــيداتبم سهرپۆلى جـــوانان[٧]
لهبـــهر دڵى تـــۆ ڕوومكــــــرده ئـــــاسمان
وتم بــــا له مـــــــــــــن نهبى دڵگـــــران

## مژدهی سهركهوتن*

ژيـــــــان، ڕۆژنامـهى خـــــاكى كــــوردهكان
ســـــــــــاحێب تـــهئريخى گــــــرهوبردهكان[١]
بنووسه مـــــژده بــــۆ هــــۆزى جـــــــــافان
نزيكـــــــــــــه خۆشبێ هاتوچۆى كوێســــتان
چـــــــــــــــــونكه ڕێككهوتن عێراق و ئێران
ڕێكرايهوه بـــــــــــــۆ بێچووه شـــــــێران[٢]
خـــــێڵ دهڕوا سهربهست بۆ ســـــاى ئێلاخـــــان
ئـــــــــهوانيش دڵخۆش دێن بۆ سهر شــــــاخان

---

[٧] ئهشێ وشهى(كوردانه) (كوڕانه) بێ، بهسهرهاتو داستانهكهش له خاكى عهرهبستانا ڕوويداوه، نــهك له كوردستانا.

* ژيان، ٥٣٥، ١٩ى تهمموزى ١٩٣٧.

[١] گرهوبرده: ئهوهى گرهو ئهباتهوه.

[٢] لهو سـهردهمـهدا ڕێككهوتنى نێوان عێراق و ئێران لهسهر جياكردنهوهى سنوور چهسپاوه.

خـــــوا بكات ڕاستبێ خـــەو و خــــــەياڵمان
بـــــــــــەرزی ئـــەبينێ خـــــاكو نيشـــتمان
ئـــــــــەوان لـەخـــۆشـييا بكـــەن چـــــراخان
ئێمەش ڕێكدەخـەين ســــــەيرانی بـــــــــاخان
ئــــــەوان ئــــــــەبينن شــــاری بـــــەغدامان
دێنــــە عـــــــــــەتەبات گــــــەورەی ئيمامان[٣]
ئــــــــــــــەزانن، چــــــونكە پێكـەوە ژيـــــان
ئـــــــــاموشۆو كــــــەسبی بێترس و زيـــان[٤]
ذاتـــــــەن، هــــــەردوو لا دينمان قــــــــــورئانە
بـــــــــــۆ يـــــەك پێغـەمبەر شــــــەهادەتمانە[٥]

---

[٣] عەتەبات: نزرگەو شوێنە پیرۆزەکان. گـەورەی ئیمامـان: (حـەزرەتی عـەلیو حـەزرەتی حسـێن)ی کوڕیو نەوەکانیان.
[٤] ئاموشۆ: هاتوچۆ. کەسب: کاسپی، کڕینو فرۆشتن.
[٥] ذاتەن، ذاتاً: لەڕاستیدا، بێگومان.

# کەو لەنزاران*

کـــــەو لەنزاران بـــــــــــە ناڵەی حــــــەزین
ئـــــــــەڵێ فیداتبم نیشـتمانی شـــــــیرین
بـــــــــــەیانیان قـــاسپەم دێ بە پێکەنین
لە خۆشـــیی وەتـــــــــــــەن، گوڵزاری ڕەنگین
لـە خــۆشیی صـەفای بــــــــەرز پـیرەمەگروون
ئـــــــــــاوی دەرمانە بــۆ ســـیلو جـنوون!![1]
لەخـــــــــــاكو خۆڵت خـــــــــــاڵم ڕەشتووە
نـــــــــاوی سـەربەرزیم گـــــەلێ بیســــتووە
خـــــــــۆ خۆشیی گۆیژەت قـــــەت مەدحی نایە
هـاوینان بـــــــــــــەفری ساردی شـــیفایە[2]
وەتــــەن چــــەند خــۆشە شـــــاخی هەورامان
ئـــــەڵێم بـــــــــــــەرزترە لە هەردی تــــاران
وەتـــــــــــــــــــەن، درەنگە بمدەرێ جــواب
نـزیکە ســـــینەم ببێ بـــــــــــــــــە کـەباب

* ژیان، ٥٣٦، ساڵی ١٢، ٢٦ی تەمموزی ١٩٣٧.

[1] صەفا: سازگاری، پیرەمەگرون: شاخە بڵند دەماخەکەی سەرووی ڕۆژئاوای سلێمانی، هاوینەهەوارێکی زۆر نایابو سەیرانگەیەکی زۆر دلگیرە. جنوون: دەردی شێتی.

[2] قەت: هەرگیز. مەدح: ستایش. شیفا: چارەونۆش، ئەوەمان یادئەخاتەوە کە هاوینان بەفری چاڵە بەفرەکانی گۆیژە تینیوێتیی شاری شکاندووە.

ج:

نیشتمان گوتی: کەوباڕی کوێستان
شۆخ و شەنگەکەی چیای کوردستان
ئێستا تاقەتی قسەم نەماوە
دواکەوتەی ئێڵم هەرلەبەرچاوە
چلۆن بێمە جواب کەوی جوانخاڵ
نابینم ڕۆڵەم لێمبپرسێ حاڵ!![٢]

## وەسیەتی گوڵی*

وەسیەتی گوڵی پاییز بۆ بلبڵ
بە ئاھ و ناڵەو شیوەنی بەکوڵ

............ ............. ............
.............[١] .. .......... .............

بلبل عومری من ڕوویکردە پاییز
دوعا خوازیی لای تۆو لای ئازیز
بلبل تۆو عەشقی سوبحی نەوبەهار
لەیادت نەچم تو پەروەردگار

---

[٢] نیوەی دووەم: ڕۆڵەکانم لێمناپرسنەوە.

* ژیان، ٥٣٩، ٢٧ی ت ٢، ١٩٣٧.

[١] دڕاوەو نەماوە.

من و زانستی هەردوو پەشێوین
لەتۆزو خۆڵدا غوبار بە لێوین
پەنامان بەخوا بلبلی ڕەنگین
جوابمبەرەوە بە لەفظی شیرین[٢]

**بلبل:**

بلبل بە ئاواز بانگیکردە گوڵ
وتی فیداتبم، شوعلەی چرای چڵ
چەند شەو ڕەنجمدا، تا بەری بەیان
من نەمدی کامی ئاشکراو پەنهان
بە ڕۆژ پەروەرانەو بە شەو دیدەبان
ئاهـ و ناڵەمە لە دەست بای بەیان[٣]
کە با تۆی ژاکاند من چۆن دەمێنم
من لە ئەشقی تۆ دایم دەخوێنم
تۆ گوڵی من و زانست گوڵی کورد
کام قەوم بێخوێندن سەرکەوت دەستوبرد
ئیتر خوات لەگەڵ ئەی خونچەی بەهار
شەرتە لە دوای تۆ کەس نەکەم بە یار

---

[٢] لەفظ: وتە، پەیف.

[٣] دیدەبان: پاسەوان.

# شەوو ڕۆژ*

مەن لەگەڵ تۆمە، ئەی ڕۆژ گوێبگرە
کە مەن دیارنەبم، چۆنی، تێفکرە[1]
سەرئەنێیتەوە، ڕووئەکەیتە شاخ
بەدڵەی خەمناک هەڵئەکێشێ ئاخ
لەدەشت ناسرەوێ، ئەچیە ژێر زەوی
دوازدە سەعات، ڕووزەرد ، ئەکەوی
بەڵێ، مەن شەوم، شەو قەڵای مێردان
شوێنی شەبەیخوون، شێرو نەبەردان[2]
بە بەبرو پڵنگ، دەعبای سەهمناک
ئەوان ئەگەڕێن، یەکسەر بەبێباک[3]
بەشەو نەبەردان ئەبن بەسەرواز
شەوە، دلێران ئەبن سەرئەفراز[4]
شەوبوو، موحەممەد ڕۆیی بۆ میعراج
خەڵاتی وەرگرت، دینی بوو ڕەواج[5]

---

*ژیان، ٥٤١، ساڵی ١٢، ١٩٣٧.

[1] تێفکرە: سەنجبدە، وردبەرەوە.

[2] شەبەیخوون: هەڵمەت و پەلاماری شەوانە بۆ سەر دوژمن.

[3] بەبر: دڕندەیەکە لەڕەگەزی پڵنگ، بەڵام گورجترو خێراترە، بەور.

دەعبای سەهمناک: دڕندەی ستەمناک، ترسناک.

[4] سەرواز: سەرباز. سەرئەفراز: سەرفراز: ئازادو سەربەست.

ئێســـتا لـەخـۆشـیی ئـــــــــــەو عـەیش و نۆشە
ئـــــەی ڕۆژ، مـــــــــــن شـەوم، دڵم هەرخۆشە!

ڕۆژ:

هاشـووهووش بەسە، بێدەنگبە ئـــــــەی شـــەو
تـــــــۆ دانراوی بـــــــــــۆ لیباس و خـــــەو
چۆن مـــــــــــــن ئەترسم شـەو، لەڕەشیی تۆ
شەوقم ڕووناکە، لە هـــــــــــــــەردو لە کـــۆ
پرسە حـاڵەتی مـــــــــــــــن لە ڕووی جـیهـان
بڕۆو بــــــــــــــــڕوانە تـەئریخی بـــابـــان[٦]
سەعدی و فیردەوسی، عـــــــــــاقڵی پڕ هۆش
لە تەعـریفـی مــــــــــــن دڵیان هاتە جۆش[٧]
شـــەوەکیان ڕوونـــاکم لـە هـــــــــــەردی ژیـان
وێنەی نـــێرەی گـورگ بکەوێتە نـــــــــاو ڕان
هــــــــــــــــەروەك لەشکرێ بشکێ و بشێوێ
تـــۆ لە ترسـی مـــــــــــــن دڵت ناسرەوێ
ڕاستی بـــــــــــــــۆ کـوردە وا گـۆڕانئەکا
ئـــــازایی ڕۆژەو شـــەو بـــــــــــەیانئەکا
ئـــــــــەی شـەو، بەسیەتی، بێوەفـــاو ویجدان

(٥)میعراج: شەو ڕەوبی پێغەمبەر (د. خ).
(٦)پرسە: سوککراوەی (بپرسە)یە.
(٧)سەعدی: زانای ناودارو گەورە، خاوەنی گولستان و بۆستان.

دواکەوتوو، ڕەنگڕەش، هـــــــەروەك سپڵەکـان
ئـــــــــەی شەو نەتبیستووە ڕۆژەکەی مەحشەر
خـــــــــــــودا حاکمەو قــــازی پێغەمبەر؟!
مـــــــــــن نەشئەی ئەوەم هەر لەبیر مـــاوە
شـوعلەم ڕووناکـە، هــــــــــــەر ڕۆژم ئـــاوە

شـــــــــــەو:
کـەواتـە قـوربان لـەبەر ئـــــــــــــــــــەو ڕۆژە
منیـش دیلی تـــــــــــــــۆم، زیاتر مەخرۆشـە

## پاییزی عومرم*

پـــــــــــــــاییزی عـومـرم گــــــەڵاڕێزانە
دیــــارەو دیار، وەخـتی خـــــــــــــــەزانـە
دیدەم، بلبلی بـــــــاخی نەوبـــــــــــەهار
دەمبەپێکەنین، ئـــــــــەی شیرین گــــــوفتار
بـــــــــــۆ تۆ کەوتە کــــار پەنجەی ڕۆژگار
مـــەئیوس لەبـــــــالآت، خـــۆشخولق و ڕەفتار(١)
جـــــەرگـی (بــــــــەنگینە)ت لـەبنـدا بـــــڕی
لەباتی ژیـــــــــان ڕۆحت هـــــــــەڵفڕی،

---

* ژیان ، ژمارە ٥٤٢ ، ٢٢ی ت ٢ ، ساڵی ١٩٣٧.

(١) مەئیوس: نائومێد.

ڕۆحت هەڵفڕی، لەسەر لقی چڵ
بەجێتهێشت هەزار دڵی نەبەدڵ[٢]
بلبل لەدوای گوڵ ڕوومەکەرە چڵ
لەخار مەنیشە، ئەچەقێتە دڵ[٣]
دنیای بێوەفا، هەروا بێکامە
گوڵشەن بەبێتۆ بۆ من حەرامە
شەم، بێپەروانە شەوقت نابینم
منیش بەبێتۆ حەرامە ژینم
مانگ بێئەستێرە هەڵنایە لە کەل
ڕۆییت، خەمناکیت خستە دڵی گەل
سیا وەش وەك تۆ زارو زەبوونبوو
سەرتاپای بالای لە دەریای خوونبوو
ئیتر وەسسەلام برای زانستی
بەش دراوە بە ئێمە پەستی

[٢]نەبەدڵ: لەهەردوو دێڕەکەدا سەرواو دووبارەیە.

[٣]لەهەردوو دێرەکەدا سەرواو دووبارەیە.

# باپیر بنووسە*

بـــــــــاپیر بنووســە نامەی بـــــــــەنگینە
کـــــە لەوانەیە پـــــــــــــەیڕەوی دینـە[1]
بـــــــــاوەڕمان هـــــەیە کـــە خـوا خـوایە
لە هـــــــەردوو دنیا ئـــــــــــــەو بێهەمتایە
ئـــــــــەتوانێ زەوی بکا بـــــــــــە ئاسمان
بـــــــەیەك هـــــەناسە، یاخـۆ بـــــــە یەك ئان
ئـــــــــەمساڵ ڕەحمیکرد بـــــــە خاوەن حەیوان
ســــــــــــەوزایی خستە دەشتو کـــــێوەکان
پـــــــــاییزی ئێمەی کردووە بــــــــــە بەهار
گـــــوێگـرە لـە قومری، بولبولان، هـــــــــوزار[2]
داخـــــــــــــــــۆ لەکوێبێ زەمزەمــەی لاوان
پـــــــاییزی کردووین بــــــــە وەختی سـەیران[3]
نـــــــــــاڵەی بێباوك گەییە ئــــــــــاسمان
لەسەر پـــــــــــەڵەدا بـــــــارانی بـــــــاران

---

* ژیان، ٥٤٤، ساڵی ١٢ ، ١٣ی ك ١ ، ١٩٣٧.

[1] باپیر: پیرەمێردی نەمر.... کە لەوانەیە پەیڕەوی دینە: واتە ئەم باسەم، لەو باسانەیە ، کە پەیڕەوی دیـن نەکا.

[2] هوزار: بولبول.

[3] زەمزەمە: کۆڕی گۆرانیو ئاهەنگ.

ئەم سەحرا شینەو گوڵو گوڵزارە
هەمووی لە لوتفی پەروەردگارە
بەس، چڵو چۆیی و نیهانکرداربین
لە دەس نەزانین بەشکم ڕزگاربین[٣]
هیچ فەرقی نەکەین کوردیو عەرەبی
دەسبدەینە بەیداخ ئایینی نەبی

## دیدەم شۆخو شەنگ*

دیدەم شۆخو شەنگ، ئاسکی سەر یاڵان
ڕەشتەی خەتو خاڵ، جەسای ڕەشماڵان[١]
دیدەم، زوڵفلوولی بەوێنەی شەوبۆ
(وەنەوشەی شاخان) خاڵی گۆنای تۆ[٢]
سروەی گوارەی زیو ئەدا لەسەر شان
خۆری نیشانەی بەر سنگی شاهان
گۆنا ئاڵ، وێنەی لەعلی بەدەخشان
زەوتیکرد، سووری، لە سێوی زەنگان[٣]

---

[٣] چڵو چۆیی: فڕو فێڵ...
* ژیان، ٥٤٤، ساڵی ١٢، ٢٠ی ك ١، ١٩٣٧,
[١] جەسای: لەسای، لەسێبەری، لەسایەی.
[٢] وەنەوشەی باخان باوترە.
[٣] بەدەخشان: شارو ناوچەیەکە لە ئەفغانستان، بە کانی لەعلی زۆریاش بەناوبانگە.

چاو ئەستێرەی کەل سەرکەژی سیوەیل
تۆش عاشقکوژی، وا بە وێنەی لەیل
بالآت نەمامی عەرعەری شکان
شوعلەی جوانیت لە ئەختەر فڕان[٤]
سینەت بە وێنەی باخی ئەرخەوان
گرتی دوو لیمۆ، نەبوو بە فنجان
دەخیلم، دوگمە، قاپیەوانی باخ
ئێشکچی، شوعلەی جووتێ شەوچراخ[٥]
وانەی عاشقی، بەستە (بەنگینە)
نیشتمانپەروەری شێوەی شیرینە[٦]
هەزار شۆخ و شەنگ، شیرینی ئەرمەن
بیکە بەقوربان زانستیی وەتەن[٧]
با وجوود وەتەن وا پێشناکەوێ
وەتەنپەروەری خوێندنی ئەوێ[٨]

---

[٤] عەرعەر: چنار   شوعلە: پرشنگ. تیشك   ئەختەر: ئەستێرە.

[٥] ئێشکچی: پاسەوان.   جووتێ شەوچراخ: دوو گەوهەری شەوانە شەوقدار، مەبەستی مەمکی یارە.

[٦] وانە: یەکەمینجارە، ئەم وشە جوانە لە هۆنراوەیەکا ببینم.

[٧] شیرینی ئەرمەن: نازدارەکەی خەسرەو، کە خەڵکی ئەرمینیا ـ ئەرمنستان ــ بووە.

[٨] با وجوود: هەرچەندە، لەگەڵ ئەوەشا.

# مەجنوون طفلیبوو*

مەجنوون طفلێ بوو، هێشتا حەوتساڵە
عاشقبوو بۆ لەیل، (بەو) جووتە خاڵە[1]
وتی حاشابێ لە سەرکۆماری
من و ماهی زەرد بە بێقەراری[2]
دایم سەرخۆشبوو، بەبێجامی مەی
بێسازو سەمتوور، بێئاوازو نەی
ئەبوو بە فیدای ئەو تەنها خاڵە
گا بە پێکەنین، گاهێ بە ناڵە[3]
ئەپاڕایەوە لە زاتی یەزدان
من لە ئەشقی لەیل ئەکەی پەشیمان
قەندیل و ئاکۆی کردبوو بە لانە
دوور بوو لە دۆستی سیفەت بێگانە[4]
دوور بوو لەوانەی چاو ئەقووچێنن
بە کاکە کاکە دۆست ئەڕەتێنن

---

*ژیان، ٥٤٧، ساڵی ١٣، ١٠ی ن ٢، ١٩٣٨.

[1]طفل: منالّی ساوا. بەو: بۆ ئەو، کورتو سووککراوە.

[2]سەرکۆماری: سەرۆکایەتیی خێڵ. ماهـ: مانگ، بەبێقەراری: بە بێئارامی.

[3]بەفیدای: بەسەر گەردی. گا، گاهێ: جارێ.

[4]شاعیرمان: لە جیهانی ئەندێشەو بۆچوونی تایبەتیی خۆیا، مەڵبەندی مەجنوونی بە بیایانی نەجدی عەرەبستانەوە گەیاندۆتە شاخە ڕەنگینەکانی کوردستان وەك بڵێ هەموو سەرزەمین نیشتمانی ئەشقە.

هاودەمی ئەو بوون شێرانی بێشە
نەیبوو لەپڵنگ ترس‌و ئەندێشە[٥]
قاسپە قاسپی کەو بووبووە تاری ئەو
باوەشێنیبوو شەماڵ وەختی خەو
هەتاکو ناڵەی گەیشتە یەزدان
بوو بە ئەستێرە، چوو بۆ ئاسمان[٦]
ئەم چەند هەڵبەستەی (بەنگینە)ی هەژار
وەك دووعای مەجنوون بکەوێتەکار

## دڵی سافی لەیل*

دڵی سافی لەیل دەربارەی مەجنوون
خەیلێ خەمگینە، جگەر پڕ لە هوون
خۆراکی خەمبوو دڵەی بە پەرۆش
هەرگیز مەجنوونی نەکرد فەرامۆش[١]
پەشێوو دڵتەنگ، لێو بە بارەوە
چاوەڕێی مەجنوون لە دیارەوە[٢]

---

[٥] بێشە: دارستانی چڕو بەرین.
[٦] وا باوە کە لەیل‌و مەجنوون بوونەتە دوو ئەستێرە.
* ژیان، ٥٤٨، ساڵی ١٣، ٢٠ی ل٢، ١٩٣٨.
[١] نەکرد فەرامۆش: لەبیری نەچوو، لە یادینەکرد.
[٢] لەدیارەوە: لەمەڵبەندەوە، مەبەستی جێو شوێنی مەجنوونە.

ئـــــــەیووت خودایا بەدکاری بـــــــــەخیل
نـــــــــەبینێ خـۆشی، دایـم بێ زەلـــــیل[٣]
سـێ مـانگەی زستان خـــــــــەمبوو خـــــەیاڵی
بــــــــــۆ دۆسـتی گـــــیانی حـاڵزانی حـاڵی
هـــــــــەر هـاواریبوو لەیلی پـــــــڕ خـەیاڵ
زوو چـلە بــــڕوا، تـــــــــــــا تـێپەڕێ سـاڵ
ئـــــەیوت، ئــــــــــاخ ئەمساڵ زوو پێشکەوتایە
بــــــــــــــەڵکو مـەجنوونم زوو بدیـایـــــــە
ئـــــــــــــــەمدی دیداری مـەجنوون سـەربەخۆ
تێر ئەمبیست نـــــــــاڵەی یــــــاری ڕەنجەڕۆ
ئـــــــــــەو ئاوارەبـــوو لـەکۆهـ و لـــــــــەیلاخ
منیـش پـــــــەرێشـان دایـم دڵ بـــــــــــــــە داخ
وەك ئـــــــــەو جـار، ڕانم بۆ کـرد بــــــــــــە سـەرین
ئـــــــــەمگرتە باوەش بـــــــــــە دڵەی حـــەزین
مـــــــن لە پەچەی مەڕ دەســـــت بــــــــە جامە شیر
ئـــــــــــەمدی مەجنوونی بـــــــــەدبەختی زویـر[٥]
ئـــــــــــەموت مەجنوونی نیشــــــــــتمانپەروەر
خــــــاوەنـی وەفا، شێری بـــــــــــــــە جەوهەر[٦]
فــــــــــەرموو، پیــــــاڵەی شـیر نۆشکە، بێپەروا

---

[٣]دایم بێ زەلیل: هەمیشە داماوبێ.

[٥]پەچە: خانوچکەیەکە، لە کەڵەکە بەرد، چەپەرێکی تێدابێ، یان لە تەیانی داروچۆ دروستدەکرێت بۆ حەشاردانی کارژۆلەو ئاژەڵ لەو وەرزانەدا کە ئاوو هەوا خۆشە.

[٦]بەجەوهەر: بەجەرگو ئازا.

دنیای بێوەفـــا لـەمەودوا ئـــــــــــەڕوا[٧]

بیگرە، بینۆشـە جـــامی بـــــــــــەهـاری

حـــــــــاشا لـە ڕەنـجی حـەقنادیـــاری

مـەجنوون فرمێسکی داڕشـت لـە چـــــــاوان

یـــــــەکـەم بـــــــۆ لەیل و دووەم بـــــــۆ لاوان

خـــــۆزگـە (بــــــــەنگـینە)ش هـەر بـەم قـەرارە

ئـــــــــەنێژرا لەسـەر گـردەکەی یـــــــارە

---

[٧]بێپەروا: بێخەم، بێباك.

# ڕۆژێ باخەبان*

ڕۆژێ باخەبان بەدڵێکی تەنگ
تەماشای گوڵی سووری کرد، بێڕەنگ(1)
پێیویت، هەی نامەرد، عەیب نییە بۆ تۆ
گوڵە زەرد لە پێش تۆدا ئەکەن بۆ !!(2)
قەتارەی بەستووە بەڕیز لە گوڵجاڕ
بە دیاری ئەیبەن بۆ شارو بازاڕ
ئەیکەن بە بۆوە، ئەیمژن تێرتێر
ئەڵێن ئەووەڵی بەهارمان خێر
گوڵە زەرد بەمە هەوا ئەسێنێ
دەماخی بەرزی بە تۆ دەنوێنێ(3)
ئەگەر پێشکەوی ئەو چۆن دەنوێنێ
دڵی ئاشقت لێئەڕەنجێنێ(4)

ج:

بەرا نەتبیستووە، حەدیثی گەورە

---

* ژیان، ٥٥٢، ساڵی ١٣، ٣ی مارتی ١٩٣٨.

(1) باخەبان: باخەوان.

(2) ئەکەن بۆ: بۆنئەکەن.

(3) هەوا ئەسێنێ: فیزو کەشخە پەیدا ئەکا، لەخۆی بایئەبێ.

(4) ئەڕەنجێنێ: زویر ئەکا، ڕەنجەڕۆئەکا.

پیاوی هۆشمەند گەلێ بە سەبرە![٥]

من خەڕۆ نابم بە بای دارئاوس
خوێندنی بلبل نادەم بە تاوس[٦]
کاتێ گوڵخونچەی من دەردەکەوێ
عالەم ڕەنگ و بۆی ڕووی ئەوی دەوێ
من بە قسەی تۆ هەڵناکێشم ئاخ
ناوم مەشهوورە: (گوڵی گوڵەباخ)!!
بەڵێ گوڵەزەرد خۆی بخنکێنێ
ساڵی یازدە، شەو ئەو، خۆی ئەنوێنێ
بەڵام من وەختێ دێمە ناوەوە
جوانان ئەمگرن بەسەرچاوەوە
کە خۆشم نەمام عەترم باقییە
زینەتی سەرو زوڵفی ساقییە!![٧]
قەدری زەڕ دیارە لەلای زەڕەنگەر
گەوهەر شناسە پیاوی بەجەوهەر
بەڵام گوڵی زەرد لەگەڵ گوڵی سوور
تێکەڵبن، جوانن، ئەدرەوشێن لە دوور

---

[٥]حەدیث: فەرموودەی پێغەمبەر (د. خ).　　هۆشمەند: هۆشیارو وریاو زیرەك.

[٦]خەڕۆ نابم: ناخەڵەتێم.　　بای دارئاوس: لە سەرەتای بەهاردا هەوا خۆشنەبێ و جۆرە بایەکی خۆش هەڵئەکا، گوایا دارو درەختی پێئەئاوسێ و ئامادەئەبن بۆ چرۆکردن، بەم بایە ئەوترێ بای دارئاوس

[٧]باقییە: ئەمێنێ.　　زینەت: جوانی، ڕازانەوە.

# گۆڕینی عەرەبی*

ڕۆژێ شـوانێ لە دەشتێکی چـۆڵ
لە گوێئاوێکا حەیوانی دا مـۆڵ
گالۆك‌و کەڕکی فڕێدا لای دار
خەو بردییەوە شوانەی هەژار[1]
لەپڕ گورگێکی باران دیدەو پیر
کەوتە خەیالات: مەڕی بێدەسگیر
خنچکەیەکی کرد، کەوتە پەلەپەل
هەڵسایە سەرپێ، بۆی هەڵکەوێ هەل[2]
گەلێ هەوڵیدا، نەیزانی عەوعەو
لوورانی، شوانە ڕاپەڕی لە خەو[3]
دەستیدایەدار، دای لە گورگی پیر
سواری سەری بوو، خستییە زنجیر
گورگ ئەیوت ئەگەر دەرچم ئەمجارە
شەرتبێ قەت نەیخۆم مەڕی ئەم شارە
هەرگیز زیانکاری نەکەم لە شوان

---

*ژیان: ٥٥٣، ساڵی١٣، ١٠ی مارتی ١٩٣٨. دیارە شاعیرمان لە زمانی عەرەبیدا ، بەتوانابووە.

[1]گالۆك: گۆچان... بەو دارە سەر نووشتاوەش ئەوترێ کە لقی درەختی پێئەگیرێ‌و ڕائەکێشرێ.

کەڕك: کەڕەك، کەپەنەك، کەپەنك: فەرەجیی گەورە.

[2]خنچگەیەکی کرد: هەڵتروشکا.

[3]عەوعەو: وەڕینی سەگ. لووران: دەنگی گورگ.

ئەگەر ڕسگاربم ئەمجار لە مەیدان،
تۆبەی سەرەمەرگ بۆی نەکەوتە کار
تووشی چورتم بوو گورگی بەدکار[٤]
شوانە بانگیکرد، های گورزەو گۆپاڵ
گورگیان یەخدا، دوو نێرە گەماڵ[٥]
یەکێ دوو دەستی، یەکێ دوو قاچی
ڕایانکێشاو، شوان وتی دەرناچی
هێندیان ڕاوەشان، گەماڵ بە نۆرە
پارچە پارچە بوو ئەو گورگە بۆرە
ئەم پەندە بگرە گوێت و ئیتر بەس
ناکەویتە شوێن زیانکاریی کەس

---

[٤] چورتم: هەڵنووتان، نسکۆ.

[٥] گورزەو گۆپاڵ: ناوی تایبەتن بۆ سەگ. یەخدا: کوتایان بەزەویدا.

# مژده*

موبارەکبادیی دەورەی دووبارە
وا ژیایەوە (ژیان) ئەمجارە[1]
لەپێش نێرگسدا ڕوویکردە بازاڕ
زوقمی زستانی کرد بە نەوبەهار
مژدەبێ، بلبل، گوڵی تەبیعەت
گەشایەوە بۆ نەغمەی حەقیقەت[2]
بلبل پێکەنی بە کاری دەوران
وتی کزنابێ چراخی یەزدان
عادەتی زەمان جارجار جەفایە
گاهێ نەخۆشی، گاه، شیفایە
بەعضەن بە قینی خۆی پێئەکەنێ
لە کردەوەی خۆی دۆشدائەمێنێ[3]
سنعەتو زانست لە کێیەباکی؟!
ئەسووڕێتەوە زۆر بە چالاکی

---

* ژین، ٥٥٤، ساڵی ١٤، ٢٦ی ك ٢، ١٩٣٨، دیارە لەم ژمارەیەوە حەفتەنامەکەی پیرەمێردی نەمر لە (ژیان) ەوە کراوە بە (ژین) هەروەها دەریشنەکەوێ بۆ ماوەی دە مانگو نیوێ داخراوەو دەرنەچووە، ژمارەی پێش ئەم ژمارەیە لە (١٠ی مارتی ١٩٣٨) دا دەرچووە، ئەم دواکەوتنو دەرنەچوونەش پەیوەندیی بە بارودۆخی ناڵەباری ئەو سەردەمەوە بووە.

[1] موبارەکبادی: پیرۆزبایی.

[2] تەبیعەت: سروشت.

[3] بەعضەن: هەندێك.

دۆش: زویرو داماو.

گاهێ لای ئـــــــــەوە وەیشوومەی خـــــەزان
گاهێ لای ئــــــــەمە نمنمەی بـــــــــــاران[٤]
گاهێ لای ئــەوە بـــــــــــەسەربەست ژیـــان
گاهێ لای ئــــــــــــــــەمــــە مەوسمی گـولآن
کـە دەستت بــــــڕوا، وە زەندت نـــــــــــەبێ
چونکە هەرچیت کـرد ئــــــــــــەوەت دێتە ڕێ[٥]
دادی ئـــــــــــەوەمە هەمو یـــــــــــەکدڵبین
بــــــــــــەیــــــــــــەکدڵیمان مراد حاسڵبین[٦]
بـــــــــە وەحدەت ئـەبێ خــــزمەتی عــــێراق
یــــــــــــەکیەتیی ئـــەوێ غایەی ئیــتیفـــاق[٧]

---

[٤] وەیشومە: دەردوبەڵا... لە دوو وشە پێکهاتووە، (وای، شووم) بە واتای (بای بەڵا، بای نەگبـەتی، بـای ڕەشبینی).

[٥] وەزەند: زیان، پێوەدان.

[٦] مرادحاسڵ: ئاوات بەدیهاتوو.

[٧] وەحدەت: یەکبوون، یەکیەتی. غایە: ئامانج          ئیتیفاق: ڕێککەوتن

# تێکۆشین*

شەوی زستانە، خەیاڵپلاوە
دڵ وا بێمەیلە، هانای نەماوە
تاوتاو بێهۆشە، پەرتە خەیاڵی
بەجارێ ئاگر بەربۆتە ماڵی
یاخود دڵخۆشیی پەرێشانیی خۆی
خۆی بەخۆی بڵێ، کوا تۆ ڕەنجەڕۆی!
بەڵام چاو زیاتر دیقەت ئەنوێنێ
بۆ سەیرکردنی هەر شەوق هەڵدێنێ[1]
بۆ سەعیکردن وای قەرارداوە
هەتا پێنجی شەو، یا پێنج بەولاوە
نیگای مەستابەی جوگرافیاو تەئریخ
بێئەوەی تێبگا لە حاڵی مەریخ[2]
نانوێ و ئەڕوانێ، وێنەی چراخان
ئەچێتە سەیری باخی تەئریخان
کە چووە فیکری تەماشاکردن
ئەزانێ چۆنە ژیان، بە مردن!
هەرگیز حازری خۆی نادا بە قەرز

---

* ژین، ٥٥٥، ٩ی شوباتی ١٩٣٩.

(1) دیقەت ئەنوێنێ: بەوردی سەرنجەدا.

(2) نیگا: سەیرو سەرنج. مەستابە: مەصطەبە: سەکۆ، لێرەدا مەبەستی سەکۆی خوێندنە...

خـزمـەتـی وەتـــــەن لای ئـەبـێ بـــــــــــە فـــەرز
ڕاســــــتە ئـــازایـی بـــۆ هــــەردوو چـــــــاوە
بــــــــــــــــەڵام پـێشکـەشـی یـــــــاریدەیـداوە
خـۆزگـــــە بــــــــــەو قـەومـە خـــــاوەن دەمـاخـە
دائـیم پــــــــــەروانـەی دەوری بـــــــــــــەیداخـە...

# هاتنەوەی پەڕندە*

بە لەلەو بەری سەر گڵەزەردە
چلە وا ڕۆیی، خۆشە ئەو هەردە(١)
ڕووی زەمین خۆشبوو، تێپەڕی زستان
باڵندە کەوتە پەرواز بۆ کوێستان(٢)
ئیتر شاد ئەبێ کەو بە نزاران
قاسپەقاسپی دێ، وەك جاری جاران
دەندووکی لەقلەق، نە قاڕەی شادی
گرمەیدێ وێنەی تەپڵی ئازادی
ڕیشۆڵە نەغمەی هەزار داستان
ئەخوێنێ، ئەڵێ، خۆشە جێگەمان
پەڕەسێلکە ئەخوێنێ قورئان
(إذ يتلقى المتلقيان)(٣)
باز پەرواز ئەکا، ئەچێتە جێی بەرز
کورسینشینە، چەشنی فەلامەرز(٤)

---

* ژین، ٥٥٩، ساڵی ١٤، ٢٠ی مارتی ١٩٣٩. پەڕندە: باڵندە.

(١) لەلەوبەری: دەربەندی پشت گڵەزەردە، (لوولەوبەری)شی پێئەڵێن، لە ناوی (لوولوو)ەوە هاتووە.

(٢) پەرواز: فڕین... باڵبە یەکادان.

(٣) وا باوە، لەکاتی خۆیا پەڕەسێلکە زانایەکی گەورەو بەتوانا بووە، کاتێ بەسەر دۆزەخا فڕیوە، لە ترس و ستەم و تینی دۆزەخ هەموو زانین و زانیارییەکی لەبیرچۆتەوە و تەنها هەر ئەم ئایەتەی لەیاد ماوەو بۆمان ئەخوێنێ.

(٤) فەلامەرز: پاڵەوانێکی زۆر ناوداری داستانی شانامەیە، کوڕی ڕۆستەمی زاڵە ...

پـــۆڕ بـــە کـــناچـــە ڕووئـەکـــاتە چـــەم
لـەو گـویٚ ئـــــــــــــاوانە ئـەگـەڕیٚ بیٚخـــەم
جــوڕەو قازڵاخـــی دەشتی بـــــــــــــــازیـان
فـەرحـناکئـــــەبن بـــــــــــە ڕۆژی ژیـــان[٥]

قـــــازو قـــــوڵنگی پـــــــــــاییز سەرشیٚواو
پــــۆل پـــۆل دیٚنەوە بـــــــــۆ سـەر چەمو ئاو
عـــەینەمـەل هـــــاتن بـــــــــۆ پاسە کوللـــــە
ئینشەڵڵا موضیر هــــــــــــــەر پــەت لە ملــــــە[٦]

---

[٥]جورە: جۆرە چۆلەکەیەکی دەنگخۆشو ڕەنگینە. قازلاخی: ئەمیش هەروا، بەلام کـەمێ گەورەترە، فەرەحناك: شاد، دلخۆش.

[٦]عەینەمەل: ڕیشەی ئەم وشەیە (ئایرەمەل، ئێرە مەل، ئارەمەل، ئاگرە مەل)ە، چونکە کە بە کۆمەڵ بدا بەسەر هەر باخو میوەیەکا لەناوینەبا... لە گەرمیانا چۆلەکە غەزایی پێئەلێن، چونکە کوللە لەناو ئەبا.

# مەتەڵ*

دوو ژن شەڕیانبوو لەسەر منالێ
منالّ لە عومری ڕابووردبوو سالێ
هەردووکیان سوێندیانئەخوارد بە قورئان
بە پێغەمبەرو بەزاتی یەزدان
عەجائیبیان ما خەڵکی لەمانە
لەم ئیدیعایەی ئەم دوو ژنانە(١)
ئەو ئەیگوت منداڵ حەلاڵی خۆمە
ئەو ئەیگوت منداڵ نۆبەرەی نۆمە
ئەم کەینوبەینە هەر نەبوو تەواو
هەردوو بە جارێ کەوتبوونە ناو
وا دوو کاربەدەست هاتنبەسەرا
ژنگەلیان پێشخست بردیاننە سەرا
مەرکەز دەعواکەی قەیکرد دەستوبرد(٢)
شەرعیان تەقدیمی قازیی وەقت کرد
بۆم بنووسنەوە حوکمەکەی قازی
ئەم هەردوو ژنە چۆن ئەکا ڕازی!!
ئیتر وەسەلام خوێندەوارەکان
لە مەتەڵزانی خاکی کوردستان

---

* ژین: ٥٦٠، سالی ١٤، ٢٠١٤ی مارتی ١٩٣٩.

(١) عەجائیبیان ما: سەریان سڕما. ئیدیعا: داواکاری.

(٢) قەیدکرد: تۆمارکرد.

# ئامۆژگاری*

مامۆستای شاعیر، پیرەمێردی کورد
ساحێب ئەشعاری بێنەزیری ورد[(١)]
ئەم چەند فەردانە بۆ ئامۆژگاری
بنووسە ناو ژین بۆ یادگاری
لە کاری دنیا و لە ئیشی دەوران
قەد نەبی غافڵ ئامان سەد ئامان[(٢)]
دنیا ژنێکی چاو بەرەو خوارەوە
هەر دەمە لەگەڵ یەکێکا دیارە،
کاروانسەرایە، هەزاری وەك تۆ
تێیدا هەڵدەسێ و ئەکا جستوجۆ[(٣)]
هاتنە دنیا ڕۆینی لەدوایە
نیوەی ئاسایش، نیوەی سزایە
کەواتە توخوا خۆشی ڕابوێرە
سوحبەتی یاران بە هەل بژمێرە[(٤)]
کەشفی عاقیبەت بە کەس ناکرێ

---

* ژین، ٥٦٣، ساڵی ١٣ی نیسانی ١٩٣٩.

(١) ساحێب ئەشعار، خاوەن هۆنراوە — بێنەزیر: نظیر: بێهاوتا

(٢) قەد: قەت ــ هەرگیز. — غافڵ: بێئاگا.

(٣) جستوجۆ: جموجووڵ: هەڵسوکەوت.

(٤) سوحبەت: هاودەمی، گاڵتەوگەپ.

ئـــەمەت لـە دڵدا نـــــەبێ بـــــــە گرێ[٥]

نـــەکەویە داوی شـــەیتانی بـــــــەدبەخت

لەناو ئـــاگرا نـــەچـــــــــیتە سەر تەخت

تـــــــــــــــۆ وەرە تۆوی چـــاکە بچێنە

بـــۆت دێتە بـــــــــــەرهەم وەختی دروێنە

خـــــــــراپە هیچی لێنایەتە بـــــــــەر

بــــــــەهیوای مەبە، تـــــــا ڕۆژی مەحشەر

نــــاوی چاکی خـــۆت مەدە بـــــــە خەسار

بمێنێت نــــــــــاوی چاکت بـــــــۆ یادگار

## مـــــژدە*

مژدەبێ، بلبل چــووە لــوتکەی چـــــــــڵ

دڵ گەشایەوە وێنەی خـــونچەی گــــــــوڵ

داکــــــەنرا لەبەر مەرگی مـــــــــــاتەمی

دڵ فەرەحناکـــبوو، بـــــــــــە خاترجەمی[١]

هـــــــەموو تـــــاڵییەك خـــۆشیی لەدوایە

پەسـتو بڵندی لەلای خـــــــــــــــوایە[٢]

---

[٥]کەشفی عاقیبەت: دۆزینەوەو دەرخستنی سەرەنجام.

*ژین، ٥٦٣، ساڵی ١٤، ٢٠ی نیسانی ١٩٣٩.

[١]بەخاتر جەمی: بەبێباکی، بێخەم، بەئارامی.

[٢]نیوەی یەکەم ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە: (ان مع العسر یسرا)

ئــــــيتر بـــــــــهاری دڵ یـەکـجارییـه
بـــــاخی سەرچنار بـــــــــهەشتوارییـه[٣]
بـــــاخی سەرچنار نـــــــــاخۆشـه بێمەی
دەســـت لـه مل شـووشـــه، پیــاڵه پـــــەیاپەی،
بلــبـل ئـــــــەخوێنێ بـۆ گـوڵ، یـــــــاریه
بـــــــــــه ئاوازی خـۆش، ســـــەر هـوشـیاریه
چـــــــڵ بڵند ئـــــــــەبێ لەم گـفتوگۆیـه،
ئینسـانی دوو دڵ هــــــــــــــەر ڕەنجـەڕۆیـه
بـــــــەلام یەکدڵبی، زۆرچـــاك ئــــــــەنوێنی
جـێگـەی فیردەوسـی بـــــــــــــۆ خـۆت ئەسێنی
گـــــوێت لە موطـریببێ، یـــــا ئاوازەی نــــەی
سـەیرت ئـەبێته بـــــــــــەزمی شاهی کــەی[٤]
هـەوای بــــــــــهاری، ئــــــــاخ بــۆ خۆشـییه
سـەیری بـــــــــــــــەکرەجۆ، ئێستا جـۆشییه
خـۆشـــــه یەکدڵبیو بــــــــــــــــەرزبێ ولاتـت
ســـــــەیری کـوردستان بێ بـــــــــه خــەلاتت

---

[٣] بەهەشتوارییە: وەکو بەهەشتە.
[٤] موطریب ـ مطرب: گۆرانیبێژ.

# نەسرین، کچی بەنگینە
## جوابی پرشنگی قانع ئەنووسێتەوە*

جـوابـتبەمەوە خــوشـکـی شـــــــیرینـم
کچـی بـــــەنگینـەم، بــــەناو (نـەسـرین)م
منیش نـۆ ســـــــاڵم، بـــەڵام لـە شـــــارم
لـە دەوری عـــــــیلما زۆر بــــــەختیارم
خوشکە گـــــــیانەکەم، پرشنـگ، کچە کـورد
هـــــــاوارو بــــــانگت زۆر تـەئسیریکـرد(١)
گـریام بـــــۆ بـــــەختی شـووم‌و شێوەشوو
وەك بێچـووە پــــەری، دەسـت عیفریتکەوتوو(٢)
لادێیـی بــــــــەوە نـانیـان بــــــڕاوە
کە قـــەدری ژنیـــان لـەلا نــــــــەمـــاوە(٣)
ئــــــــەوە گــۆڕیـانبێ، کـزو بــــارکێشـبن
لـەژێر سـوخـرەدا هـــــەر نـــاوکەڕێشـبن(٤)
خــوا پێداو بـــــــــە ڕۆژ بیشـچەوسێتەوە
شـەو بـــــــــە خۆشـیی ژن ئـەحـەسـێتەوە

---

* ژین، ٥٦٥، ساڵی ١٤، ٤ی مایسی ١٩٣٩.

(١) تەئسیریکرد: کاریکرد، کاریگەریی هەبوو.

(٢) پەری: فریشتە. عفریت: دێو، درنج.

(٣) قەدر: ڕێز.

(٤) ناوکەڕێش: گیان‌و لەشڕووشاو.

ژن کە هاو (کوف)بێ، ئەوها دەردیەتی
ڕۆحی لە دەوری سەری مێردیەتی[٥]
دڵسۆزی مێردە، ژن خەمڕەوێنە
نەك موستەحەقی بەڵغەمو جوێنە[٦]
ئێستا ئەوانەی فێرن بەجنێو
لەناو گاگەلا ئەیانکەنە کێو،
ژن بۆ تەشکیلی عائیلە دێنن
کە ئەولادی چاك پێبگەیەنن[٧]
بە ئەولادی چاك وەتەن سەربەرزە
خزمەتی وەتەن لەلامان فەرزە
ئێمە شووکردن بەدەست خۆمانە
نە بە خەنجەرە، نە بە گۆچانە
لەناو ئێمەدا جاهیل نەماوە
بەخوێندەواری کارمان تەواوە[٨]
پیرانی ئێمە گشت خوێندەوارن
لە کتوکوڵکی سنگیان بێزارن
بە تەوالێتو سەر بەسدارە

---

[٥] هاوکوف ــ کفء: هاوشان.

[٦] موستەحەق: پێشیاو.

[٧] تەشکیلی عائیلە: پێکەوەنانو دروستکردنی خێزان. ئەولاد: منالّ، نەوە.

[٨]جاهیل: جاهل: نەخوێندەوار... بۆیە شاعیر وتوویەتی نەخوێندەوار نەماوە، چونکە بەبۆچوونی شاعیر ڕێژەی نەخوێندەوار لەو سەردەمەدا زۆر نزمبووە، ئەوەش گەڕاوەتەوە بۆ کاریگەریی قوتابخانەی زانستی ئەگینا ئێستاش ڕێژەی نەخوێندەوارمان زۆرە.

دەمبەپێکەنین، بـــــــــــــــــۆ ژن دڵـــــداره[٩]

بـــــــــــــــە حەفتا ســـــاڵیش کچـۆڵە دێنـن

بـــــــــــــــە زمـانی خـۆش ئـەیانخـەمـڵێنن[١٠]

وا دارۆخــــــــــــــــان ـ یــش مەکـتەبنشـینە

مەکتەب بــــــــــۆ عەرضـی کچان پـەرژینـــە[١١]

## جــوابی تاران*

بـــــــرای خۆشــەویســت (مـوخلـیص)ی دانـــــا

بـــــــــــــــە دیدەو خـیرەد، داناو تـوانـــــا[١]

جـوابی نـــــامەکەت ئـەنووسم بـــــــــــــەدڵ

چاپار بیهێنێ، مـەنزڵ بـــــــــــــــە مـەنزڵ[٢]

قاصید نـــــــــــــامەکـەی دووهـەمی هێنـــــا

لـەسـەر برینی دڵی خــــــــــــــۆم دانـــــا[٣]

---

[٩] تەوالێت: مەبەستی سەری ڕووتو قژی داهێنراوی پیاوانە.

سدارە: جۆرە کڵاوێکی قووچو درێژە، لەسەردەمی عوسمانیدا کاربەدەستانی میری کردوویانەتە سەریان.

[١٠] ئەیانخەملێنن: پەروەردەیانئەکەن، ئەیانگەشێنەوە... دیارە دڵخۆشیی پیانی داوەتەوە.

[١١] مەکتەب: قوتابخانە. عەرض: نامووس: شەرەف.

* ژین، ژمارە٥٦٨، ساڵی ١٤، ١ی حوزەیرانی ١٩٣٩... لەوەڵامی نامەی (موخلیص ــ ئاوارە)دا کە لە (ژین)ی ژمارە ٥٦٧ دا بڵاوکراوەتەوە.

[١]موخلیص: ناوی (فەیضوڵڵای غەرقی)یە، کوڕی حاجی میرزا عەبدوڵڵای موخلیصە، لە سەقزەوە هاتوونەتە سلێمانی و شێخ مەحموودی نەمر داڵدەی داونو گەلێ ڕێزی لێگرتوون.

[٢] چاپار: نامەبەر، تەتەر. مەنزڵ: قۆناخ.

وامزانی شەوە، بە خەو ئەیبینم
وا ژیایەوە ڕۆحی شیرینم
وەك بە چەپکە گوڵ، ئاوپڕژێنی دڵ
بەبۆن و عەتری مەقصوود بوو حاسڵ[٤]
کە دیم زەرفەکەی نووسراوە ئێران
پایتەختی کەیان، شارەکەی تاران[٥]
کەی بە خەو ئەتدی دووریی سلێمانی
دانا بووی، بەلام بەخوا ئەتزانی
باوکت ئەبینم، دڵبریندارە
وەك ژەهرانخوارد ماوە لەم شارە
نالەت گەیشتە گەردەکەی سەیوان
ئەی سەرچنار!! چی!! نموونەی کەیوان
ئەی جادەی تازەو باخی بەکرەجۆ
لەبیرتە تیایا ئەتکرد هاتوچۆ!!
ئەی چوار شەموانی کارێزی شەریف
پڕ لەشۆخ و شەنگ لەذیذو لەطیف[٦]
مەڵێ باخاتی تاران ئەبینم
بڵێ کوردستان سەرمایەی ژینم!!

---

[٣] قاصید: نامەبەر.

[٤] مەقصوود بوو حاسڵ: ئاوات هاتەدی.

[٥] کەیان: بنەماڵەی شاکانی ئێران.

[٦] کارێزی شەریف: کارێزەکەی بەردەمی گردی مامەیارە، سەیرانگای شار بووە.

لەذیذ: بەچێژ. لەطیف: ناسك و جوان.

هەرچەند بـــۆ ئـــێمە بـــــــــەڕەنجی شـانە
بـــــــەڵام هەر فەخرە، جێی بـــاپـــیرمانە[٧]
بـــــــــاقی وەســـسەلام، سەرت نـــــــەئێشێ
هـێندە لێم دووری، مــــــــــن جـەرگم ئێشێ

## لەتارانەوە
## (موخلیص ـ ئاوارە) بۆ بەنگینە*

بـــــــــرای خۆشـەویست کاکە بـــــــەنگینە
لەدووریـی ئـــــێوە دڵم خـــــــــــــەمگـینە
دەنووسم بـــــــــــــۆ تـــۆ سەلامی تـــەواو
بۆ بـــاقیی یـــاران، لە پـــیر تا بـــــــەلاو[١]
بـــــــــــەنگـینە، مـوخلیص لەئـــێوە دوورە
لەشـاری تــــــــــــــاران مـات و ڕەنجـوورە[٢]
وەکـــیلی منی لەلاوانی کـــــــــــــــــــورد
ئـــــــــەهلی زانستی، گـەورە تا بـــــــــەورد
دووعــــــــــــــاو ســــەلامی بێحەدو حساب
بکە تـــــــــــــەبلـــیغ و طەلەبکە جـــەواب[٣]

---

[٧] فەخر: شانازی.

* ژین، ٥٦٧،ساڵی ١٤، ٢٢ی مایسی ١٩٣٩.

[١] باقیی یاران: دۆستەکان، برادەرەکان، هاوڕێکانی تر.

[٢] ڕەنجوور: داماو ، ڕەنجەڕۆ، نائومێد.

بۆمان بنێرن، دیاریی شیرین
ڕۆژنامەی کوردی، یا جەریدەی ژین،
بۆ سلێمانی جەرگم کەبابە
بێئێوە جێگەم پڕ لەعەزابە
بۆ ئەرخەوانی گردەکەی سەیوان
جەرگم پارەیەو ناڵەم تا کەیوان[٤]
یادی (ئاوارە) بکە لە تاران
باقی سەلامم بۆ حاجیو یاران

## پیری پڕ هونەر*

پیری پڕ هونەر، باخەوانی ژین
بنووسە وەسفی خوێندن ڕێگەی دین[١]
ئەم ئامۆژگارییە بۆ براکانم
بۆ فەخری عێراق، یا نیشتمانم
وا ئاخر ڕۆژی ساڵی خوێندەوار
هاتە پێشەوە، ئازابن، هوشیار
قوتابییەکانی لادێ، ئەهلی شار
ڕەنجی ساڵێکتان مەدەن بەخەسار

---

[٣] بێحەد: بێڕادەو سنوور. تەبلیغکە: بگەیەنە. طە لەبکە: داوابکە.

[٤] پارەیە: هەلاهەلایە، ئەنجن ئەنجنە کەیوان: بورجی کەشکەلان: زۆر بەرز.

*ژین، ٥٧٠، ساڵی ١٤، ١٥ی حوزەیرانی ١٩٣٩.

[١] پیرەی پڕ هونەر، باخەوانی ژین: مەبەستی لەپیرەمێردی نەمرە، کە ژینی دەرکردووە.

مەكتەب باخێكە، سێبەرو سوپەر
بۆ گەنجی زیرەك لاوی پڕ هونەر[٢]
مەكتەب بەهەشتە بۆ پیاوی هەژار
هەزار دواكەوتووی كردووە بە سەردار
خۆت ئامادەكە، بە هونەرەوە
ڕۆژێ لێپرسین جواب بدەرەوە
لەلای موعەللیم ئازابەو دلێر
خۆت ئامادەكە، وێنەی بێچووە شێر
كەلێتئەپرسن وەتەنت كوێیە؟!
بڵێ عێراقە، میللەتمی لێیە
كە لێتئەپرسن خزمەتی بەیداخ
بڵێ بەیداخمان دوڕی شەوچراخ[٣]
دوو ئەستێرەكەی وەها ئەنوێنێ
بۆ كوردو عەرەب شوعلە هەڵدێنێ
ئیتر وەسسەلام بڕای پڕ هونەر
زانین بنوێنن، زۆرچاك وەك جەوهەر[٤]

---

[٢] سوپەر: سپێر، سەنگەر.

[٣] خزمەتی بەیداخ: سەربازی.

دوڕی شەوچراخ: ئەو گەوهەرەی لەشەودا شەوق‌و بریقەی وەكو چرای داگیرساوە

[٤] جەوهەر: گەوهەر بەواتای دەمارو جەوهەرو تینی پیاوەتیش هاتووە.

# خودات لەگەڵ*

خودات لەگەڵبێ بەهاری بێشەوق
ئەمساڵ خۆشیمان لێبوو بەتەوق
سەوزەی سەحراییت گۆڕیبوون بە شین
نە ئەهاتە گوێم قاقای پێکەنین
(نەتئەدی) زڕەی پیاڵەی لێو نەخشین
(نەمئەدی) خرنگەو خشپەی هەڵپەڕین[1]
نەماندی بەزمو ڕەزمی سەرچنار
نەماندی پۆلی کیژی شەدەلار[2]
نەماندی کۆڕی مەیخۆر لە گوێی ئاو
لەباتی شەراب نۆشیمان زووخاو
نەماندی بلبل بچێتە سەرچڵ
بخوێنێ بە ناز شیعری خونچەی گوڵ
نەمدی قەتارەی ڕێگای (وڵووبە)
نەمدی لەنجەو لار جوانی مەحبووبە[3]
نەمدی سەیرانی زانست وەك سالان

---

* ژین، ٥٧٣، ساڵی ١٤، ٦ی تەممووزی ١٩٣٩.

(١) لەبەرئەوەی (دەنگ) نابینرێ، ئەبوایە وشەکانی ناو کەوانەکان بەم چەشنە بوونایە: (نەتئەبیست).

(٢) بەزمو ڕەزم: ئاهەنگو سەیران.

(٣) قەتارەی ڕێگای وڵووبە: ڕیزو ڕێچکەی کاروانو ڕێبوارانی ژنو پیاو، کە لەدێهاتی بەری قەرەداغەوە، لە قۆڵی وڵووبەی خوار سلێمانییەوە هاتوونەتە شارو گەڕاونەتەوە.

ناوبانگی بپروات ئێران و تووران...
بەهار بۆ وات کرد ئازیزت مرێ
(پیرەمێرد)میرات سەدساڵەت بگرێ[٤]
(شێخ سەلام) لەدوور بۆ تۆ بخوێنێ
(بێکەس) بەدەست خۆی حەققی بسێنێ[٥]
(موفتی)یەکەی پێنجوێن تۆزی تەماکۆ
توورەکەبێژ کات بۆ دووچاوی تۆ[٦]

# گۆرانی*

هەموو هەوڵمان بۆ بڵندی عێراقە
بڵندی بەدەست یەکێتی و ئیتتفاقە
هەوای ئەم ڕەواقە
لەدنیادا تاقە[١]

---

(٤) پیرەمێرد: پیرەمێردی زاناو شاعیری نەمر.
میرات: میراث ، کەلەپوور، هەرچی شتێك لە پێشوانەوە بمێنێتەوە.
(٥) شێخ سەلام: شێخ سەلامی شاعیر، ١٨٩٢ ـ ١٩٥٨... لەو سەردەمەدا لە پارێزگای حلەدا مووچەخۆری میری بووەو دوورخراوەتەوە ... (بڕوانە دیوانی سەلام، ١٩٥٨، لا ١٨).
بێکەس: فایەق بێکەس: شاعیری نیشتمانپەروەری بەناوبانگ ١٩٠٥ ــ ١٩٤٨ .
(٦) (موفتی)ی پێنجوێن: مەلا عەبدوڵلای موفتیی پێنجوێن، ١٨٨١ ــ ١٩٥٢، هاوڕێ و هاوڕازی (قانع) بووە.
تەماکۆ: توتن، ئاماژەیە بۆ کارو پیشەی، کە (توتنچی و جگەرە فرۆش) بووە.
* ژین،٥٧٥ ساڵی ١٤، ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٣٩ ... لە پێشەکییەکی کورتدا وا نووسراوە: لەسەر هەوای مانەمی غازی کە پیرەمێرد وتوویەتی.

ڕەفیقان هــــەموو بـــــــا فیدای عـــەلەمبین
لەدەوری عـــــــەلەم ئەهلی سەیف و قەڵەمبین[٢]

بـــــــــــــەپـــــارەو درەمبین
خـــــــــــــەریکی کـــــــەرەمبین[٣]

چ خۆشـە نـــــــــەسیمی ئـــێوارەی وڵاتـمان
شـــــــــەی خۆشەویستی بخاتە حـەیاتمان[٤]

لەســەر ڕێی نــــــــــــــــەجاتمان
بـــــــــــــــــەصەبرو ثــە باتمان[٥]

بـزانن، چ دڵگــــــــیرە سروەی بــــــــەیانیان
بـــــــەشەوقی شـەبەق بێ لەکێوی دووکانیان[٦]

بـــــــــــــــە نـەغمەی مـــــــەلانیان
فـــــــــــــــەرەحبێ دڵانیـــــــــان[٧]

هــــــــەتا کەی بوەستین، وەرە ساقی، سادەی
کـەرەمکە بنۆشـین شـەرابی پــــــــــەیاپەی[٨]
بـــــــە تەوحیدو یاحەی جیهان بێتە هـەی هەی[٩]

---

[١] ڕەواق: هەیوان، نیشتمان. تاقە: تاکە، بێوێنەیە.

[٢] ئەهلی سەیف و قەڵەم: دەستەی شمشێرو خامە.

[٣] کەرەم: بەخشینەوە، بەخشندەیی.

[٤] نەسیم: شنە: سروە.

[٥] نەجات: ڕزگاری. صەبر: ئارام.

[٦] دووکانیان: گوندو ناوچەیەکە، کەوتۆتە سەرووی شارۆچکەی عەربەتی نزیك بەسلێمانی.

[٧] بەنەغمەی مەلانیان: بەئاوازی باڵندان. فەرەحبێ دڵانیان: دڵیان خۆشبێ.

[٨] کەرەمکە: پێمان ببەخشە: فەرموو. پەیاپەی: یەك لەسەر یەك، خێرا خێرا.

# هاته گوێم*

هاته گوێم ناڵەی کوردێکی نەخۆش
لەبەر ئازار خۆی، دڵەی پڕ خرۆش
بۆ بەفری کوێستان، دەروونی بەجۆش
گا گا ئەینالآن، گا ئەهاتە هۆش
خاڵ لەژوور سەری، مات و سیا پۆش
وتی ئەی لالۆم دڵم بکە خۆش
ئەم چۆڕە دۆیە، وەرە بیکە نۆش
نۆشی گیانتبێ و ببە فەرامۆش،
من لەتۆ زیاتر دڵم هاتە ئێش
کەوتەوە بیرم مەرگی قەوم و خوێش...
نەخۆش هاتە جواب بە ئاهـ و فوغان
وتی ناگەمە هەوای کەلیخان(۱)
بەرزیی بان ئێلاخ وا پەستیکردم
بەو حەسرەتەوە ڕابورد، وا مردم(۲)
خاڵە، ئەم کارە، کە، وا هاتە پێش

---

(۹) تەوحید: یەکتاپەرستی. یاحەی: هاوارە بۆ زاتی خوا.. زۆرتر لەکۆڕی سۆفی‌ودەروێشانا ئەم هاوارە بەرز دەبێتەوە. هەی هەی: هاوارو بانگی خۆش وشادی.

* ژین، ٥٧٦، ساڵی ١٤، ١٧ی ئاغستۆسی ١٩٣٩.

(۱) فوغان: هاوارو گریان. کەلیخان: کوێستانێکی زۆر بەپیتە کەوتۆتە بەینی سەقزو بانە.

(۲) ئێلاخ: کوێستان. حەسرەت: داخ.

وەسیەتبێ لەلای گشت قەومان و خوێش
ڕێی نەکەڕۆزم بەزۆر لێگیرا
بەکوێری و کزی هەروام لەبیرا[٣]
ئەگەر مامەوەو نەچوومە کوێستان
تووخوا بمبەنە گردەکەی سەیوان
نزیک گردەکەی یارە بمنێژن
وەسیەتم لەلای پیرەمێرد بێژن
شینم بۆ ئەکا پیری دڵ جوان
ئەمخاتە سەر زار گشت خوێندەواران
لەوێ بەرامبەر گردەکەی یارە
هەوای کوێستانم لێوە دیارە
لە ئێوارانداا شەماڵم بۆ دێ
لە بەرەبەیاندا نەسیمم بۆ دێ[٤]
سروەی نەسیمی گۆێژەشم بۆ دێ
ئاواتی ڕۆحم بەوە دێتە جێ

---

[٣] نەکەرۆز: لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە، کەوتۆتە بەینی سەقزو بانە، بەلای باشووری سەقزدا، کوێستان و هاوینەهەوارێکی زۆر سازگارە.

[٤] وەکو سەروا سێ جار (بۆ دێ) دووبارەیە.

# ولاتم بەرزە*

ولاتم بەرزە وێنەی بەهەشتە
خەلەو خەرمانی وا لەپێدەشتە
چوار دەوری کارێز، ئاوی ڕووناکە
بەعیلم و زانین بەرزە ئەم خاکە
پڕ لە شۆڕەبی و دار هەرمێ و هەنار
هاوینی خۆشە، وێنەی نەوبەهار
شەرق و شیمالی سەهۆڵ و بەفرە
دواکەوتن لەلای ئەم قەومە کفرە[١]
سەیرانگای خۆشی لەسەرچنارە
ئاوەکەی دایم وێنەی بەهارە
لەو پەیدا ئەبێ ئاوی تانجەرۆ
جێگەی زەرعاتە بۆ خاکەکەی تۆ
هێجگار شاربازێر هەمووی بێستانە
عالەم ئەیزانێ شوێنی کوێستانە
خۆ پیری پیران شەهنشای شاخە
بڵند دەماخ و بەرزە دەماخە[٢]
گەر خزمەتیکەین فەسڵی هاوینان

---

* ژین، ٥٧٩، ساڵی ١٤، ٧ی نەیلوولی ١٩٣٩.

[١] شەرق: ڕۆژهەڵات. شیمال: باکوور.

[٢] پیری پیران: پیرەمەگروون.

مـــەعلوم خـــۆشـــــترە لە جەبەل لـــــــــوبنـــان
دەربـەنـدی بـــــــــازیـان هـێلانـەی بـــــــــازە
ڕۆحی قـەومێکی لـە بــــــــــــــۆ پــــــەروازە
بـــــــــــــــاخی قـــــەرەداخ هـێلانـەی شـێرە
لـەمیوەی ئــــــــــــــاودار (دۆڵەوا) تــــــــــێرە[٣]
خـــــــۆزگە هــــاوینان جێی سەیرانبـــــــوایە
لێی پــــــــــەیدا ئـــــەبوو مەرام وغــــــایـە[٤]

## شین بۆ هاوین*

وا گـــــــــەلاوێژکەوت، دانیشتووم خـــــــەمگین
بـــــــــۆ بەرگسووکی و بێئەرکیی هــــــاوین[١]
بــــــــــــــە نــــــــان و دۆیـێ ڕامانئـــــەبوارد
خـــــۆمان بێلێفـە بـــــــــــــــە خـاك ئەسپارد
هـــــــــــەژار دەستئەژنۆ، هــــــــەموو دۆشداماں
بـــــــــــۆ لیژنەدارو تـــــــــرخێنەی زستان
کــــــــە دیت گـــــــــــەلاوێژ پرشنگی وەشـاند

[٣] دۆڵەوا: چەم و دۆڵێکە کەوتۆتە ڕۆژئاوای قەرەداخ، کاتی خۆی باخێکی بەرین و فراوانبووە،
[٤] مەرام: مەبەست.               غایە: ئامانج.
* ژین، ٥٨٠، ساڵی ١٤، ١٤ی ئەیلوولی ١٩٣٩.
[١] گەلاوێژ: ئەستێرەیەکە، کاتێ کە هەڵدێو دەرئەکەوێ، وردە وردە گەرما کز ئەبێ و وەرز بەرەو سەرما هەڵئەکشێ.

گەلاڕێزانی فەقیری نواند
ئاخ بۆ ئەوانەی کە سەربەست ئەژیان
هەموو سەربانێ بووبووە دیواخان
هەموو بنچکێ بووبووە چراخان
لە دەشتو دەرا بە خۆشی ئەژیان[٢]
چەرمی پێی پێڕووت بوو بوو بە کلاش
پێخاوس کەوشی کەوتبووە بەلاش
بە دام دیرەکێ پیاوێ تێر ئەبوو
بە شووتییە کوڵە نەفسێ کوێر ئەبوو
ڕەنجی ڕۆژەیان دەرئەچوو لەبیر
تا وەختی نووستن بە ڕاو و تەدبیر
بەڵام لەمەولا خەفەتی سەرما
قوڕی زستانی داوە بە سەرما
جگە لە خەمی شەکر گرانی
هەر بەقاڵەی دەم قاتییان هانی[٣]
شاگردی پیرم، (حاجی بەنگینە)
بلبلی زانست پەروانەی ژینە[٤]

---

(٢) بنچك: لێرەدا مەبەست بندارەکانە.

(٣) قاتییان هانی: دوایانبری، هیچیان نەهێشت... لێرەدا مەبەستی شاردنەوەی بژێوییە بۆ ئەوەی گرانتر بیفرۆشنەوە.

(٤) شاگرد: قوتابی. پیر: پیرەمێردی نەمر.

# بۆ باوکی دڵسۆز*

بۆ باوکی دڵسۆز پیرەمێردی کورد
قەڵەمت لە چاو نەزانین توند کرد
وەك تیری ڕۆستەم کە دای لە شوغاڵ
کونیکرد لەگەڵ چناری کۆنەساڵ
دادم بنووسە لە دادگای ژین
خۆت و یارانت دەبێ هەر بژین
تێناگەم گونای چییە بەنگینە
کە باخچەی ژینی لێ بە پەرژینە(١)
(ئەگەر دەرمئەکەی ) دووعائەخوازم
من لە دوور زیاتر بە ژین ئەنازم(٢)
هەڵکەوتووی ........... ............
(٣)............. ............... .................
ئەیخوێننەوە تا ڕۆژی حەشر
قەبرەکەت ببێ بە دانە قەسر
تۆو ئەمین زەکی خزمەتتان زۆر کرد
هێناتانە ناو، ناوی قەومی کورد(٤)

---

* ژین، ٥٨١، ساڵی ١٤، ٢١ی ئەیلوولی ١٩٣٩.

(١) گونا: گوناه: تاوان.

(٢) ناوکەوانەکە بەم چەشنە بخوێنرێتەوە (ئەگەر دەرمەکەی)، کێشەکەی تەواوە.

(٣) داخوراوە، ڕزیوە.

میللەت بێئێوە ناوی کوێرە
ئەڵێن کوردستان پڕبووە لە نێرە
باقی وەسسەلام، ڕۆڵەت (بەنگینە)
لەخۆشی تۆیە، فەردی ڕەنگینە[٥]

## من و دڵ*

دڵ پاییزی لا بوو بە بەهار
ئەیویست بچێتە سەیری سەرچنار
من بە دڵم وت پاییز سەرمایە
بۆ وا کەوتیتە سەر ئەم سەودایە!!
پێیوتم ئاشق سەرما نازانێ
زستان و بەهار وەك یەك ئەڕوانێ
پێموت ئەی دڵە جیهان خەمبارە
هەرچی دەبینی بێئیش و کارە
وتی بێباکبە لە دەوری دەوران
هەروا بزانە بوو بە دۆست بۆمان
هەرچی نووسرابێ دەرمانی نییە
دڵ مەڕەنجێنە، گوناهی چییە!![١]

---

[٤] ئەمین زەکی: مێژوونووسی ناوداری کورد
[٥] فەردی ڕەنگینە: هۆنراوەی جوان و ڕازاوەیە.
* ژین، ٥٨٢، ساڵی ١٤، ٥ی ت١، ١٩٣٩.
[١] هەرچی نووسرابێ: مەبەستی چارەنووسە.

ئەی دڵ بەتەنیا ناچمە سەرچنار
دوور لەزەردو سوور، بەبێبەزمی یار

دڵ:

تۆو جامی شەراب، پیاڵەی (دنیا) ڕەنگ
ئێوەش لامانبن بانەبین دڵتەنگ[٢]

## هاتنی وەصی*

جەژنی سلێمانیبوو
پڕ ئاصەفیی ثانیبوو
هەفتەی ڕابوردوو شادبووین
لە خۆشییانا ئازاد بووین
شار ئاینەو چراخان
شەوقیدایە ئاسمان[١]
ڕۆژی جومعە بە یەکجار
چوونە دەرێ ئەهلی شار
بۆ پێشوازیی شەهریار
خۆشخولق و شیرینگوفتار[٢]

---

[٢] دنیا ڕەنگ: بەوێنەی ئەم جیهانە کە لەسەر هیچ بارو ڕەنگێ ناوەستێ...

* ژین، ٥٨٤، ١٦ای ت ١، ١٩٣٩... وەصی ــ عەبولنیلاه ــ خاڵی شا فەیسەڵی دووەم.

[١] ئاینە : ئاوێنە، بەجۆرێ شار ڕازابوەوە وەك ئاوێنە ئەینواند.

میللەت بەدیداربوون شاد

لە خۆشییا ئەبوون دڵشاد

ڕەنجمان نەچوو بە زایە

میللەت گەیشت بە غایە[٣]

کرایەوە سانەوی

بۆ وەتەن خەڵات گەیی[٤]

بژی وەحدەتی عێراق

نەمێنێ جەهل و نیفاق

ئەپارێینۆ لە یەزدان

بژی وەصیی عێراقمان

لەگەڵ فەیسەڵی ثانی

پێکەوە، بە هاوشانی...

---

[٢] شەهریار: پادشا، خۆشخولق، ڕەوشت جوان. گوفتار: وتە، قسە.

[٣] بە زایە: بەفیڕۆ، بەخەسار. غایە: ئامانج، ئاوات، ئەنجام.

[٤]لەم هۆنراوەیەدا، بۆمان دەردەکەوێ کە قوتابخانەی دوا ناوەندی (سانەوی) لەشاری سلێمانیدا، لەسەرەتای ساڵی خوێندنی (١٩٣٩ ـ ١٩٤٠)دا کراوەتەوە.

# بەمیاو میاو*

بەمیاو میاو ئەم دوو پشیلە
باڵندە لەدەست ئەوان زەلیلە
گەر بێتو هەردوو پشیلە نەمرن
کەو و کۆترمان ڕەچەڵەك ئەبڕن[1]
پشیلەی مەڵکەندی کەو ئەخنکێنێ
ئەترسم فەلەك نۆبەی من بێنێ
هەردوو کەوەکەم دەنگخۆش و نازدار
نایانگۆڕمەوە بە بازی سەردار
ئەترسم گوربە بیانفڕێنێ
وەك کۆتری (جۆلا) ملیان بشکێنێ[2]
کەوەکەم بکا بەکۆتری جۆلا
فریاینەکەوم بە پەل و تێلا
ئەبێ بنووسم لە بۆ سێوسێنان
بڵێم کاك (قانع) ئامان سەد ئامان[3]
بۆ ئەم بەهارە کەوم بۆ بنێرە

---

* ژین، ٥٨٥، ساڵی ١٤، ٦ی ت ٢، ١٩٣٩.

[1] ڕەچەڵەك ئەبڕن: لەناو ئەبەن.

[2] جۆلا: ئەحە جۆلای شاعر، یەکێکبووە لە شاعیرە میللیەکان و لە (ژیان و ژین)دا گەلێك هۆنراوەی بۆ بڵاوکراونەتەوە.

[3] لەو سەردەمەدا، مامۆستا (قانع) لە گوندی سێوسێنانی ناوچەی قەرەداخ بووە.

با دانامەمێنم بۆ کەوێ لێرە
نەیکەی بەو ساڵەی لە دارۆخان بووی
دیاربوو بۆ دیاری کە بەزڕ دەرچووی[٤]
کەوێکم ئەوێ کورد تەبیعەتبێ
بۆ شەڕی جینسی خۆی بەهیممەتبێ[٥]
لەڕۆژی ڕاودا هێندە بخوێنێ
دووکەڵی تفەنگ لێکنەڕەوێنێ
بۆ شەڕە کەویش کە چووە مەیدان
کەو ببەزێنێ بە شەقتێهەڵدان

## جەژنت پیرۆز بێ*

جەژنت پیرۆزبێ ڕۆژنامەکەی ژین
تۆ باخچەی گوڵی، بۆ گشت، بێپەڕژین
تۆ خونچەی دایم ئەگەشێیتەوە
وەك ئاوێنەی دین ئەدرەوشێیتەوە
دەستت ئەگوشم بەدڵێکی پاك

---

[٤] زڕ: بێبەر، بەتایبەتی بۆ درەختی بێبەر بەکارنەهێنرێ، بێکەڵك.

[٥] جینس: توخم: نەوە.          بەهیممەت: بەتوانا: لێهاتوو... بەداخەوە بە پڕوپاگەندەی ناحەزان ئەم بۆچوونە هەڵەو پڕ لە نالەبارییە، لەناو زۆربەی زۆری کۆمەڵی کوردەواریمانا، سەردەمێ پەرەیسەندبوو، زۆرتر جێی داخە، کە هەندێ لە شاعیرەکانمان قۆستوویانەتەوە بۆ ناو دەقی هۆنراوەکانیان، بەڵام لەبەر شەپۆلی ڕۆشنبیریی ڕاستەقینەدا، ئەمچەشنە پڕوپووچییە ڕوو لە نەمانە.

* ژین، ٥٨٦، ساڵی ١٤، ١١ی ت ٢، ١٩٣٩.

پیری تۆ وازوو نەچێتە ژێر خاك
من ڕۆژی عارفە مانگی ڕەمەزان
ئەپاڕێمەوە لەزاتی یەزدان
بۆمان بمێنی بەتوولی زەمان
چونکو بە وەفای بۆ خاکی کوردان
من بەتۆ ئەڵێم، جەژنت بێ پیرۆز
تۆ دوڕچی ئەکەی بۆ هۆزی دڵسۆز[(١)]
بیکە بە دیاری بۆ ئەو لاوانە
لە وەتەن دوورن وێنەی بێگانە
کە تۆ بۆت نوسین جەژنە پیرۆزی
ئەبێ بەخۆشی لەدوور بۆ هۆزی
ئەیخوێننەوە بەدڵێکی خۆش
ماتەمیی دووری ئەکەن فەرامۆش
ئەڵێن زۆر شوکر ژین نەفەوتاوە
بۆ یادگاری وڵاتمان ماوە
سوپاسیئەکەین، ڕەببی بمێنێ
وێنەی جامی جەم لەدوور بنوێنێ[(٢)]

---

(١) دوڕچی: گەوهەرچی، گەوهەر فرۆشی، مەبەستی لە هۆنراوە بەنرخو بەرزەکانی پیرەمێردی نەمرە، کە لە (ژین)دا بڵاویکردوونەتەوە.

(٢) جامی جەم: ئاوێنەی جەمشید، جەمشید، یەکێکبووە لە شا زۆربەدەستەکانی کۆنی ئێران .. ئەڵێن ئاوێنەیەکی زۆر سەیرو گەورەی دروستکردووە، گوایە وەکو تەلەفزیۆنی ئێستا زۆر شوێنی دووری تیا بەدیکردووە... بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا ئەم ئاوێنەیەی لەسەر شوێنێکی زۆر بەرز داناوەو بەهۆیەوە ئاگاداری هەڵسوکەوتی لەشکری خۆیو لەشکری دوژمن بووە.

# تەئریخی هیجری*

تەئریخی هیجری گەییە پەنجاو هەشت
جەژنی ڕەمەزان بردینییە بەهەشت[1]
جەژنی پاییزمان بوو بە نەوبەهار
وا ڕازایەوە بە گوڵ دەوری شار
خۆ پشتی تازەی شەقامی دووەم
لێکیئەڕەواند هەورو تەمی خەم
وێنەی گوڵاڵان لە سای دەربەندان
زەردو سەوز، پۆل پۆل، نەشئەی نیشتمان
هەڵپەڕکێی کوڕان بە نالەی شمشاڵ
لە لایە خەمزەی چاوکاڵ و لێوئاڵ[2]
بەجووت ئەچوونە ناو جۆلانێبا
وەك بەڵکیسەکەی مەلیکەی سەبا[3]
گوممەتەی ئاسکی دەوری (پیر مەنصوور)
دڵی ڕاوکەری ئەکرد بە تەندوور[4]
هەر قەمەرە بوو پڕ لەمنداڵان

---

* ژین، ٥٨٧، ساڵی ١٤، ٢٨ی ت ٢، ١٩٣٩.

[1] تەئریخی هیجری: مێژووی کۆچ، کۆچی پێغەمبەر(د. خ) لە مەککەوە بۆ مەدینە.
پەنجاو هەشت: ساڵی (٣٥٨)ی ك.

[2] خەمزە: ناز.

[3] سەبا: سەبەء، پاتەختی (بەڵقیس)، لەوڵاتی یەمەن.

[4] گوممەتە: خۆگیفکردنەوەو ئامادەبوون بۆ بازدان و قەڵەمباز. ئاسك: بەواتای کیژۆڵەکان.

دەم بە گۆرانی و هەلهەلەکێشان
خۆ عارەبانە ئەهاتن چوار چوار
ڕێگا بڕا بوو پیابڕوا ڕێبوار
لە نەعرەی لاچۆی دوو چەرخەسوار
پڕ لە ئاواز بوو چوار شەقامی شار(٥)

## بەبۆنەی کردنەوەی
## ئێستگەی کوردیی بەغداوە*

مژدەبێ کوڕگەل، وا ناومانرا
ڕادیۆ زبانی کوردی تێخرا
خاڵە پیرەمێرد، خاوەندی ژیان
گەوهەر فرۆشی دووکانچەی کوردان
من ئەمشەو سەرم گەییە ئاسمان
ڕادیۆ، بەگوڕەی کوردی ئەینەڕان
تۆو ئەمین زەکی، ذەکاتان نەواند
ئاثاری کوردان ئێوە تۆوتان چاند(١)

---

(٥) نەعرە: نەڕە، هاوار.
دوو چەرخە: پاسکیل، دیارە لەو سەردەمەدا شەقامەکانی شار چوار بوون.
* ژین، ٥٩١، ساڵی ١٤، ٢٢ی شوباتی ١٩٤٠.
ئێستگەی ڕادیۆی کوردی لەبەغداد، ساڵی (١٩٣٩) کراوەتەوە.
(١) زەکاتان: زیرەکیتان.

ئەو بۆ تۆی نووسی کوردو کوردستان
تۆش مەم و زینت هێنایە مەیدان[٢]

ئەو بۆ تۆی نووسی جلدەکەی دووهەم
تۆش دوازدە سوارەت نیشاندا بێخەم[٣]

ئەو لە هەر لایەك وەك جەمشیدی جەم
ناوی هەردووکتان نامرێ، خاترجەم[٤]

ئەو بۆ تۆی نووسی کوردان چۆن ئەژیان
خۆ تۆش زانستیی کوردت پێگەیان

ئەو بۆ تۆی نووسی مێژووی سلێمانی
خۆ تۆش مەولەوی و ڕۆحەکەت هانی[٥]

ئەو لەبیریایە، گەورەکانی کورد
ڕۆشنایی چۆنبوو، کاتی دەستوبرد

قسوورتان نییە لەخزمەتکردن
حەیفە دانرێن ئێوە بۆ مردن[٦]

---

[٢] (مێژووی کوردو کوردستان) بەرهەمە ناودارەکەی ئەمین زەکی... (مەم و زین) (دوانزە سوارەی مەریوان)بەرهەمە دیارەکانی پیرەمێرد.

[٣] (مێژووی کوردو کوردستان) بەرهەمە ناودارەکەی ئەمین زەکی... (مەم و زین) (دوانزە سوارەی مەریوان)بەرهەمە دیارەکانی پیرەمێرد.

[٤] خاترجەم: بێخەمە، دڵنیابە.

[٥] مێژووی سلێمانی: بەرهەمێکی بەنرخی ئەمین زەکییە. ڕۆحی مەولەوی: بریتییە لەبەشێکی زۆری هۆنراوەکانی مەولەوی، مامۆستا پیرەمێرد هەر بە هۆنراوە، لە شێوەزاری هەورامییەوە گۆڕیونی بۆ شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست، لاپەڕەیەك هەورامییە، وشەی (ئەسڵ)ی بۆ داناوە، بەرانبەرەکەی شێوە زاری کرمانجیی ناوەڕاستە، وشەی (ڕۆحی) بۆ داناوە .

[٦] قسوور: کەمو کوورِی: کەمتەرخەمی.

یاخوا، کە پیربوون ببنەوە جوان
فەخری ژیانن ئێوە بۆ کوردان
وا لەهەردووکتان، دوا، (بەنگینە)
بە شەو ڕەشپۆش و ڕۆژ، هەو، برینە[٧]
هەرچەند دواکەوتووم دڵم برینە
هێشتا بەم حاڵەش ژین لام شیرینە

## لەژینەوە بۆ گەلاوێژ*

گەلاوێژەکەی بەرزیی ئاسمان
ئەستێرە تازە، فەخری نیشتمان
وا لە لاپەڕەی ژینی سەرزەمین
سپاستئەکەین، پێکەوە بژین
بۆ ئەم نەورۆزەی پێشڕەوی بەهار
تۆوی گیا سەوز بوو، کەوتە گەڵا، دار
بلبل لەگەڵ گوڵ ئاشتئەبێتەوە
نەغمەی سەد ڕەنگی بەرزئەبێتەوە
کەو لە (دێوجامە) کۆ ئەبێتەوە
لەسەر چاواندا ئاو ئەژیەتەوە[١]

---

[٧] دوا: باسیکرد. هەو: کێم.
* ژین، ٥٩٤، ساڵی ١٤، ١١ی نیسانی ١٩٤٠.

بەفر لە شاخ و کێو ئەچێتەوە
دەرگای هاتوچۆی گەل ئەکرێتەوە
سەیری سەرچنار خۆشئەبێتەوە
زەردو سوور لەوێ کۆئەبێتەوە
شارەزوور بە گوڵ نوێئەبێتەوە
چاوەڕێی خێڵە، کەی بۆی دێتەوە!!
زانستی دیسان هەر بەم قەرارە
ئەچنەوە بەرزیی گردەکەی یارە
ژین و گەلاوێژ دوو شیعری میللی
هەرچی نەیەوێن تەوق بچێتە ملی

[1] دێوجامە: کراسی دێو، پارچەیەك قوماشە، بە سەدان پارچەی بچکۆڵە و ڕەنگاوڕەنگی پێوەدەلکێنرێن، لە ئاستی چاودا دوو کونی باشی بۆ ئەهێڵرێنەوە، ڕاوکەر بەچوارچێوەیەکی سووکەڵەدا، قایمینەکات، دارێکی درێژی دوو فاقەی پێوەئەبەستێ و، لەو دەشت و کێوانەدا لەسەر کانییەکان کەوی لێکۆئەبنەوەو پێیانسەیرە، دەستنەکەن بەچرەچرو قیژاندن، لەم کاتەدا ڕاوچی هەڵوێستەیەکی بۆ ئەکات و تەقەی خۆی ئەکات و زرمەیان لێهەڵئەسێنێ.

# خاڵە پیرەمێرد *

خاڵە پیرەمێرد، باخەوانی ژین
سەروەری زانست، بۆ وەتەن پەرژین
بۆ ئیستعراضی ڕۆژی پێنجشەممە
هەرچی بنووسین هێشتا هەر کەمە[1]
هەشت مەکتەبی ڕۆژ، وەك ڕۆژی ڕووناك
ساحەی مەعاریف بوو بوو تابناك[2]
خۆ جگەرگۆشەی دایکی نیشتمان
پۆل پۆل هاتبوون هونەریان ئەنوان[3]
دەفڕین بە باڵ وەك بێچووە پەری
دەشتیش بەهەشتبوو، ئەوانیش پەری[4]
میللەت بەیەکجار، گەورە تا بە ورد
کڕنووشی شادیی بۆ یەزدان دەبرد
پاشای خۆشەویست (ڕەمەزان پاشا)
پێوە دەگەڕاو، دەیکرد تەماشا[5]

---

* ژین، ٥٩٦، ساڵی ١٤، ٩ی مایسی ١٩٤٠.

(١) ئیستعراض: استعراض، نمایش، نواندن.

(٢) دیارە لەو سەردەمەدا تەنها هەشت قوتابخانەی ڕۆژ لە سلێمانیدا هەبوون، بەمەشا دەرئەکەوێ شار گەورە نەبووە. تابناك: ڕووناك، درەوشاوە.

(٣) جگەرگۆشەی دایکی نیشتمان: مەبەستی ئەو قوتابییانەیە کە لە نمایشگەکەدا بوون.

(٤) سەروا دووبارەیە.

(٥) ڕەمەزان پاشا: پارێزگاری سلێمانی بووە.

زانست ئاثاری قەدیمی نوان
چۆپیی گرتبوو پیری دڵجوان[٦]
عەزیز ئەفەندیو شێخ کەریم، هەردوو
ڕەونەقیاندابوو بە تیپی ئوردوو[٧]
ئیتر بە خۆشی گەڕاینەوە شار
یاخوا هەر بژین، میللەتی هوشیار

# وتەی بەنگینە*

وتەی بەنگینە بۆ گەوهەر فرۆش
وەرامی ئەوێ، دڵ بێنێتەجۆش[١]
خاڵەی خۆشەویست، زانایی زەمان
(پیرەمێرد) لەقەب، شاعیری کوردان
ئەگەر لاوچاکێ وەك ڕۆستەم وابێ
دەوران لێدراو، سەر لێشێوابێ

---

[٦] ئاثاری قەدیم: شوێنەواری کۆن، کەلەپووری باپیران... لێرەدا مەبەستی لە نواندنی بەسەرهاتی دێرینە. پیری دڵجوان: پیرەمێردی نەمر.

[٧] عەزیز ئەفەندی: مامۆستا عەزیز فەرەج سەلیم (١٨٩٢ ـــ ١٩٦٥). شێخ کەریم (١٩١٠ ـــ ١٩٧٢): مامۆستا شێخ کەریم کوڕی حاجی محەممەدی باراوی، بە خاڵە شێخ کەریم ناسرابوو.

ڕەونەقیاندابوو: گەشەیاندابوو.

ئوردوو: لەشکر: لێرەدا مەبەست لە کۆمەڵی قوتابییان و تیپی دیدەوانانە.

* ژین، ٥٩٩، ٦ی حوزەیرانی ١٩٤٠.

[١] گەوهەر فرۆش: مەبەستی لەمامۆستای نەمر پیرەمێردە، واتە هەر هۆنراوەیەکی گەوهەرێکە.

بۆی نەیەتە کار هێزو تەوانا
چۆن ڕزگاریبێ ئەو مەردی دانا!!
ئاگرێ بسووتێ بە ئەمری یەزدان
ناکوژێتەوە بە کردەی ئینسان!!
دایم بڵێسەی زیادی ئەسێنێ
ئەگەر لای ئینسان کزیش بنوێنێ
خاڵە!، بەشەری بەدمایەو بەدکار
بەچاکە، زیان چۆن دێنێتە کار!!
کە هات چاك بڵێ، ئەیکا بەخراپ
ڕاستی لێنایە، بە قەڵەم و چاپ،
یا کەسێ چاکبێ هەتا سەر چاکە
بەخراپەی ئەو کەس باوەڕ ناکا
لام وایە تۆوی چاکە بچێنێ
بە بڵێسەی ئاگر زەرەر نابینێ
بەڵام جوابەکەم بۆ بخەرە ناو ژین
خراپ نەمێنێ، چاکان هەربژین(٢)

(٢) شاعیر پەیڕەوی پەندەکانی پیرەمێردی نەمری کردووە، هەرچەندە داوای وەڵامیشی لێکردووە، بەڵام لەو ژمارانەی ژیندا، کە بەردەستم کەوتوون وەڵامی (پیرەمێرد)م بەرچاونەکەوت.

# مژدەی سەرکەوتن*

مژدەبێ بۆ تۆ پیری کۆنەساڵ
سەرکەوتن زانست گەورە، تا مناڵ
لەکیستان نەچوو ئەو تۆوەی چانتان
وا هاتە بەرهەم بۆ کوڕوکاڵتان
ناوتان ئەمێنێ تا ئاخر زەمان
بوون بەدڵسۆزی خاکی نیشتمان
لە (یەك) سەرکەوتن، ڕوویانکردە دوو
ئەوەی کفتەی خوارد لەدەستیدەرچوو
لە (٢) پۆلێك چوون بۆ (٣) بە ئاسان
دیسان مژدەبێ بۆ گەلی کوردان
لە (٣) دەستەیەك دەرچوون بۆ چوار
ئۆخەی ... لە جەهل ڕزگاربوون یەکجار
لە چوار بە خۆشی ڕوویانکردە پەنج
دەمبە پێکەنین، وەك خاوەندی گەنج
نیشتمان بە خۆشیی ئەوان دڵشادە
یەکسەر لە ڕەنج و خەفەت ئازادە
لە پێنج بەخۆشی ڕوویانکردە شەش
منیش شاعیریم وەرگرتووە بەش

* ژین، ٦٠٠، سالی ١٥، ١٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٠.

تا بەرزیو خۆشیی ئەوان ببینم
ڕۆحم تازەیە، خۆشە لام ژینم
پەروانەی زانست (حاجی بەنگینە)
ئەم مژدانەیەی لەلا شیرینە

## ئەی دڵ بناڵە*

ئەی دڵ بناڵە بۆ ئەم بەهارە
عالەم لە سەیرە، بۆ تۆ زەنهارە(۱)
گەشتی گشت عالەم لەدەشتو سەحرا
تۆیش لەگەڵ خەمدا وابووی بەبرا
چوونی سەرچنار لەگەڵ زانستی
بە گۆرانیی خۆش، ئاوازەی هەستی
لە دوای ئەو وەختە، دڵ، ناچم بۆ دەشت
ئارەزووم نییە بەسەیرو بە گەشت
بە تۆ چی سەیری قۆرییە شکاو
با بەهەشتیشبێ، ئەی دڵ، بەشخوراو(۲)
با هەڵپەرکێشبێ، لەوڵووبە، ڕێی چەم

---

* ژین، ٦٠١، ساڵی ١٥، ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٤٠، بەبۆنەی داخستنی زانستییەوە وتوویەتی.

(۱) زەنهار: هاوارو داد، شین.

(۲) قۆرییە شکاو: کاریزو کانییەکی سازگار بوو، جاران ئەکەوتە ڕۆژئاوای سلێمانی، ئێستا داپۆشراوەو کەوتووەتە ناوەڕاستی شارەوە، (پارکی ئازادیی ئێستا).

ئـــــــەی دڵ بینـۆشـە لـەبــاتـی مـەی، خــــــەم
لەتـــــــــــۆ دوورکەوتـۆ زانســت سێشـەممە
ئـــــــــــەی دڵ بـیبینی بـۆ تۆ ســــــتەمە،
بـۆ ئـەو کـۆمەڵەی زمانـی ئـــــــــــــــەپڕان
مێشکی جـەهلی لـەیــــــــەك ئـــــــەتـرازان
دوو دڵـی هــــــــــەڵگـرت لـە ســـــــلێمانی
کـــۆمەڵبووین بــــــە شـەو، وەك یـاری گـیانی
کــــاریزی شـەریف، کوا وەك بـــــــــــەهاران
ئـــــــەبووە ســــــــەیـرانگای زانستیو یـــاران
ئێســتاش چـاوەڕێی وەخـتی هــــــــــــەرماوە
ئـــــەڵێ بەهاری (پـــــــیر) نـــــــەفەوتـاوە
ئـــــــــــەی دڵ کـاریزێ لـەپشــتی شــــــارە
ئـــــــــــەویش وەك گـردی یـــــارە یـادگـارە

**جوابی دڵ:**

دڵ قینـی هـەڵسا، هـــــــاتـە جـواب لە مـــــــــن
وتـــــــــــــــــی لقی کـەیف لەقبووە لـە بـــن
ئـــــــومـێدی ژینی زانستو ژیـــــــــــــان
لـە دڵ دەرمـەکـە بــــــــە درێژیـی جــــیهـان
ڕۆژێکـت زانی هـــــــــــاتـەوە مــــــــەیدان
عــــێراق ســەربەرزبـێ بـۆ قەومی کـــــــوردان

# خۆشهاتن*

## ﴿ خۆشهاتنی ئەو میوانە خۆشەویستانەی کە هاتوونەتە زیارەتی نیشتمانی خۆشەویستمان﴾

راپەڕە لە خەو، ئەی دڵ بە خۆشی
خەمت با بەسبێ، خۆشی بنۆشی
بڵێ نیشتمان، خۆشئاوو هەوا
لەڕووی زەمیندا (جنة الماوی)[1]
ئەمساڵ تۆ کردت یادی دوورکەوتووان
ڕوویانکردۆتە خاکی ولاتمان
هاتنی ئەوان بۆ ئێرە جەژنە
جەژنێکی وایە شادی بێچەشنە
بۆیە دڵخۆشن، بە تۆ ئەنازن
نەسیمی بەیان لە تۆ ئەخوازن
باوەشێنیانکە، وەك شێری مەیدان
بە کزەی شەماڵ، یا هەوای ژیان
یا بە نەشئەی ساف گردەکەی نەورۆز
یا بە هەناسەی زانستیی دڵسۆز[2]

---

* ژین، ٦٠٤، ساڵی ١٥، ٢٥ی تەممووزی ١٩٤٠.

[1] جنة الماوی: بەهەشتی بەرین.

[2] گردەکەی نەورۆز: مەبەست لە گردی مامەیارەیە، کە هەموو ساڵێ پیرەمێردی نەمر ئاگری نەورۆزی لە سەر کردۆتەوەو ورشەو گەشەو شادیی خستۆتە بینایی و دڵی دانیشتووانی سلێمانی.

یا بە ڕووناکیی ئاوی سەرچنار
یا بە گوڵزاری بەکرەجۆی نازدار
یا بە بادەی کەیف (بەنگینەی باقی)
لە خۆشیی زانست بووە بە ساقی[٢]

## شێخ بابە عەلی ـ شمان مرد*

دنیا بایەخی بۆ هیچ کەس نییە
نایشبێژرێ لای کەس، حیکمەتی چییە
شێخێکی گەورەو لە عالەم دیار
چووە پەناهی لوتفی کردگار
بیستو پێنجەمی مانگی ڕەمەزان
قەدر، چووە لای خودای قەدرزان[١]
عیلمی (نووریێ) بوو، چرای ئەم شارە
ئێستاکە (نووری) لە جێی دیارە[٢]
یاخوا ئەو نوورە هەر نەکوژێتەوە

---

[٢] بادە: مەی.

* ژین، ٦١٠، ٧ی ت ٢، ١٩٤٠. شێخ بابە عەلی ــ تەکیە ــ زانایەکی بەناوباگو بەتوانا بووە ١٨٥٥ ــ ١٩٤٠.

[١] قەدر: ليلة القدر: خوالێخۆشبوو لەو شەوەدا کۆچیکرووە.

[٢] نووری: کوڕی شێخ بابە عەلی (١٨٨٦ ــ ١٩٥٦) زانایەکی گەورەو شاعیرێکی بەتوانا بووە، لە ژیانو ژین و گەلاوێژدا، گەلێ هۆنراوەی بەرچاو ئەکەون ... بەناوی (نووری بابە عەلی) نوسیوویەتی.

بۆ ڕێی دنیاو دین بدرەوشێتەوە
عیلمو دین بەندە بە چوار پایەوە
یەکێکیان ڕووخاو نوێکرایەوە

## ڕۆڵەی نیشتمان*

ڕۆژێ ڕێمکەوتە لای گۆڕستانێ
هاتە گوێم نالەی کزی ئینسانێ
بانگمکرد خاوەن پەژارەی ژێر خاک
بۆچ ئەنالێنی زویرو خەمناک!!
وتی نائومێد لە وەسڵی یار بووم
ئەو گرفتارو من بێقەرار بووم
پێمگوت چۆن ئەبێ یار گرفتاربێ
کێبێ بتوانێ خەصمی نازداربێ!!(١)
دەنگی هەڵبڕی بە کوڵی گریان
وتی، من مەیلم دابووە نیشتمان
ئێستا لێرەشدا، کە خاکنشینم
ئەم نیشتمانەش بە یار ئەبینم...
وتم، خەم مەخۆ، ڕوو لە خۆشیانین
ئێمە ئاسوودەی دەوری جیهانین،

---

* ژین، ژمارە ٦١٢، ڕۆژی دەرچوونی ڕزیوەو دیار نییە.

(١) گرفتار: گیرۆدە، گیرخواردوو. خەصم: نەیار، ناحەز، دوژمن.

وتی مردنم گەیشتە سەد ساڵ
هێشتا ئەو ئەشقەم ماوە لە خەیاڵ...
ئەو ئەشقەی ئەو بووی، دوای سەد ساڵ مردن
خستمیە سەر ڕێی گیانفیداکردن...

## سوپاسی لاوان*

سوپاسیانئەکەین، خاوەند تەدبیران
ئەمساڵ جلیانکرد بۆ کوڕە فەقیران
گەورەیی خۆیان دەرخست بە یەکجار
یەزدان بیانکات دائیم بەرقەرار[۱]
کە لەئاسمان بارییە سەر ئەرز
ئەرزیش شوکرانەی لا ئەبێ بە فەرز
سا کوڕگەل تووخوا ئێوەش بخوێنن
لەسەری ساڵدا خۆتان بنوێنن
هەرگیز لە سەعی مەبن پەشیمان
بەشکو ڕۆشنبێ چرای نیشتمان
سەرتاپا عێراق، جنووب و شیمال
با خاڵی نەبێ لە ئەهلی کەمال[۲]

---

* ژین، ٦١٣، ١٣ی ك ١، ١٩٤٠.

(١) دائیم بەرقەرار: هەمیشە بەردەوام و ڕاوەستاو.

(٢) جنووب‌و شیمال: باشوورو باکوور. ئەهلی کەماڵ: دەستەی زاناو ڕۆشنبیر.

که لەبەرتانکرد ئەم بەرگە تازە
وەتەن بۆ ئێوە ئاواتخوازە
دووعایەك بکەن، وەك فەردی عارف
زیندووبێ و بژی دائیم مەعارف[٣]
یەکەم چرایە بۆ ئەم زەمانە
شوعلەی زیادبێ بۆ ئەم کوردانە[٤]
(بەنگینە) ئەڵێ، بژی ئەم خاکە
جگەرگۆشانی دائیم بێباکە

## هاواری بەنگینە بۆ گرانی*

خۆزگە، وەك تووتن بوو بە ئینحیصار[١]
رووی پارەیان دی لادێیی هەژار
ئێستا تێر زکی خۆیان نان ئەخۆن
گەرمئەبنەوە بەدۆشاوو رۆن
ئەم گرانییەش چاریبکرایە
تەماعکارەکان دەستیان بڕایە[٢]

---

[٣] فەردی عارف: مرۆڤی زاناو خواناس.
مەعارف: لەجێی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ئێستابووە.
[٤] شوعلە: شەوق.
* ژین، ژمارە ٦١٧، ١٣ی شوباتی ١٩٤١.
[١] ئینحیصار: دەزگایەکی میرییە، بۆ وەرگرتنی تووتنی جوتیاران.
[٢] تەماعکار: چاوچنۆك، ئازکار.

هـــــــەی داد، هـــــــەی بێداد، لەڕێی خودادا
ڕەنجی هــــەمووومان ئـەدەن بـــــــــەبادا
گـشت حـاصلاتێ لـە پـــــــــــار زۆرتـرە
لە هــــــــەموو ساڵێك هـــــــەوا خۆشتـرە[٣]
کـەچی هـــــــــەتا دێ نـــــــرخ گرانئـەبێ
مـاڵی فـــــــــەقـــــــــیری پێوێرانئەبـێ
لەو نـــــــــــاوچەیەدا تا سێ ســـــاڵی تر
بیخـۆین، بیبەخشـین، هـــــەمانە شـــــــەكر
کـەچی بــــــــــە هیچە، پـــــــەتی ئیحتیکار
کەوتـۆتە ملی فەقـــــــــــیرو هـــــــــەژار[٤]
هـــــــــــەتـا دێـت نان و ڕۆن گـرانئەکـــەن
بــــــــەکورتی، هـەروا خـەڵك تــــاڵانئەکــەن
ســــــەلکێ چـەوەندەر بـــــــــە پێنج ئانـەیـە
کەســـــی تێـــــدانییە ئـــــــــەم وێـرانـەیـە
(بــــــــەنگینە) وەرە، تـــۆش بــــــەنگبکێشـە
لە هــیچ تێمــەگە، ئـــــــــاخ هەڵمەکێشـە!![٥]

---

[٣] حاصلات: بەروبووم، بەرهەم، داهات.

[٤] ئیحتیکار: دەستگرتن بەسەر شتا بۆ ئەوەی گرانتر بفرۆشرێتەوە، پاوانکاری.

[٥] بەنگ: جۆرە گیایەکی هۆشبەرو زیانبەخشە، تلیاك.

# یاخوا بەخێربێی*

یاخوا بەخێربێی، خۆشهاتی بەهار
خۆشەویستی من، ژیانی گوڵزار
نمەی بارانت ئەڕژێتە سەر چڵ
لێیپەیدا ئەبێ خونچەو بەرگی گوڵ
سوپاستئەکات بلبل بەیانیان
چونکە تۆ نەبیت، ناپشکوون گوڵان
نەورۆز بەیادی تۆ ڕەنگی سوورە
ئێستاکەش بۆ کورد جەژنی مەشهوورە
بە یادت سوورە ڕووی هەردو چیا
دەستلەملانن گوڵ لەگەڵ گیا
ئۆخەی چەند خۆشە نیشتمانەکەم
وێنەی بەهەشتە جێی سەیرانەکەم
شیرین سەیرانگا، هەردوو چاوەکەم
سبەینان قاسپەی کەوت یادئەکەم
حوسنی وەتەنمان سەرچناری خۆش
دڵی سەد بێهۆش دێنێتە خرۆش[1]
باپیر فیداتبم خاوەن ژیان و ژین

---

* ژین، ژمارە ٦٢، ٦ی مارتی ١٩٤١.

(١) حوسن: جوانی

لاوان وەك بلبل، بۆ گوڵزار كزین
هەموو ئەناڵین بۆ گردی یارە
ئەمان بەهارە، دڵ گرفتارە
یاخوا ئەو كوردەی وەتەنی ئەوێ
خۆی و خاكەكەی دائیم پێشكەوێ

# پرسیار لە نەورۆز*

ئەی نەورۆزەكەی گردەكەی یارە
شەوقی ئاگرت لە عالەم دیارە
تۆ لە كەیەوە جەژنی كوردانی
خۆت لەلای ئێمە بەچی ئەزانی!!

ج:

باوو باپیرتان هەموو بەهاران
كە ئەژێرانەوە زەوی و نزاران
ڕەهێڵی تازە ئەهاتە بەریان
كردیانە جەژنی سپاسی یەزدان...

كەوابێ ئاگرت نووری یەزدانە
بەو شوكری خوایە جەژن و سەیرانە

---

* ژین، ٦٢٤، ١٧ی نیسانی ١٩٤١.

ڕۆڵەی زانستی و بەنگینەی شەیدا
بەتۆوە شەوقیان بۆ ئەبێ پەیدا!!
چونکە قدوومت کە بدا دیار
جەژن و شادییە دیارەو دیار
بەنەغمەی بەرزی و ژین و گەلاوێژ
کوردان ڕاپەڕین، کەوتوونە ڕاوێژ
یاخوا لەسایەی عەرشی عێراقا
بەخۆشی بژین لە ئیتتیفاقا

## هەناسەم ڕێگای*

هەناسەم ڕێگای دووری گرتەبەر
خوا دادمە، شەو تا ڕۆی سەحەر(1)
سالآن دڵشاد بووم، دائیم لە سەیران
ئەمساڵ جەرگم وا بووە بەبریان
ماتم و خەمناك، ڕووتی زەمانە
فریادم لەدەست شینی جیهانە
نەوەك هەر ئێمە، بەهاری عالەم
ئیمساڵ گیراوە بەبای دەردو خەم
خەم وا لەسەر خەم، باری جیهانە

* ژین، ژمارە ٦٢٨، ٢٥ی مایسی ١٩٤١.

(1) ڕۆ: ڕۆژ. سەحەر: بەیان. واتە هاوارو ناڵەو دادمە، تا بەرەبەیان.

دائیم لەو دەورە بەردەبارانە
ڕەنگزەردو عاجز، ڕوو لە ئاسمان
ئەپاڕێینەوە لەزاتی یەزدان
بەشکو هاوینمان بۆ بکا بە بەهار
(لەیسە) بێخەفەت لەڕووی دیای شار[٢]
دڵ گرفتارە، منیش خەمگینم
ئەمساڵ سەرچنار بەخەو ئەبینم
نە من، نە زانست، نە برا کوردەکان
نابینینەوە دڵشاد، وەك جاران
هەڵپەڕکێ و بەزمم بوو بەئای، بێداد
سا خوا هاوار، فریادڕەس، فریاد
یاڕەب بە حاجەت سەییدی عالەم
نەجاتبێ ڕۆحی عالەم لە ستەم

## ژینی خۆشەویست*

ژینی خۆشەویست، چرای نیشتمان
ڕووناکیی چاوی وردو درشتمان
تۆش ئاگاداربە لەکردەی زەمان
خستیە جەولانە ئەرزو ئاسمان

---

[٢] لەیسە: نییە .. لەم شارەدا کەس نییە بێخەمبێ.

* ژین، ژمارە ٦٤٢، ١١ی ئەیلوولی، ١٩٤١.

چڵو چڵو یەك چەندە خوێنڕژا
مێشكی چەند جوانان بە بۆمبا پژا[1]
لە سایەی گرانیی ئەموالی جاپان
ڕانكو چۆخە كرایە بەرمان!![2]
شاڵی شەقڵاوە بەرگی مەردانە
لامان عەیبنەبێ، چونكە هەرزانە
فاسۆلیای جەرمەن یاردەی بە دینار
خورییەكەی تۆیە هێناویەتە كار[3]
دەخیلە، كوڕگەل، توو زاتی یەزدان
بیكەین بە صنعەت، نەیدەین بە هەرزان
چونكە من نەمدی وەك جاری جاران
جاوی گازەری ئەهاتە مەیدان
لەجێی قۆندەرەو پۆتینی بیلاد
كەوش و كڵاشیان ئەكەوتەوە یاد[4]
خۆزگە بەرگنی لەتیفی ئازیز
ئەكرا بە قاپووت بۆ ساردیی پاییز

---

[1] چڵو چڵو یەك: مەبەستی ساڵی (١٩٤٠ ــ ١٩٤١) ە، لە ساڵانی سەرەتای دووەمین جەنگی جیهانو گەرمەی كوشتار.

[2] ئەموالی جاپان: كەلوپەلو قوماشی ژاپۆن، بریا لەم سەردەمو ڕۆژگارەشا چینی هەژارو دەستكورتەكان ئەیانتوانی ڕانكو چۆخە لەبەر بكەن!!

[3] فاسۆنی جەرمەن: قوماشی ئەڵمانی بۆ بەرگی پیاوان.

[4] بیلاد: نایابو باش، جاران بە كەلوپەلو شتومەكی بیانی وتراوە(بیلادی)، لەم سەردەمەدا كڵاش لەپێڵاو زۆر گرانترە.

خەوە (بەنگینە) تۆ نووسیت بۆ ژین
فەخرە بەو جۆرە هەموومان بژین

# بۆ عەلی مەردان*

ڕانەکەم ڕۆیی بندارەو بندار
چلێ داویەتی لە گۆنای نازدار
بریا من بوایەم لە جێی ئەو چڵە
تێر بممژیایە خوێنی ئەو گوڵە
بالآت وەك چنار نەمامی ساڵێ
زوڵفت ڕێحانە، لە دەستم ئاڵێ
بەس بە لەنجەو لار چاوت هەڵهێنە
تووخوا غەریبم، دڵەکەم مەشکێنە
من سوێندتئەدەم بە نیشتمانت
بە ئاوو هەوای گۆیژەو قەیوانت
بە بەفری پیری شەهنشای شاهان
بەنیوە نیگای بڵند دەماخان
تۆ کچە کوردی، هەر سەربەرز بژی
یاخوا ئاواتی بەرزیت بێتەدی
یاخوا ئەو خاکە تۆ دەژیێنێ

* ژین، ژمارە ٦٤٨، ٤ی ل ١ ١٩٤١، دیارە شاعیرمان ئەم هۆنراوەیەی بۆ ئەوە داناوە (عەلی مەردان) بیکا بەگۆرانی.

لەسەر زەمیندا هەر شۆخ بنوێنێ
ناوت چەند خۆشە، چەند مەزەداری
ئۆخەی کچە کورد تۆ گوڵی هەناری!
کڵاوی زێڕو پەرچەمت جوانە
خاڵ لەسەر گۆنات بووەتە نیشانە
کەنیشکی کوردی، ئەچی بۆ کوێستان
چاوت ئەستێرە، هەڵدێ لە ئاسمان
کۆڵوانە لە کۆڵ، خاوەنی لەنجە
سەد باهووت شکاند بە زەبری پەنجە[1]

## سکاڵای پۆڕو کەو*

ئەوا پۆڕو کەو لێکهاتنە زبان
بە گلەییکردن لە حاڵی کوردان
پۆڕ:
پۆڕ بە کەو ئەڵێ، ئەی کورد تەبیعەت
لەبەرچی هاوڕێت ئەخەیتە زیللەت
بۆچ بۆ بێگانە تۆ خۆت ئەمرێنی
بە قەسپە قەسپ بۆچی ئەخوێنی!![1]

---

(١) باهوو: قۆڵو بازوو.

* گۆڤاری گەلاوێژ، ساڵی ٢، ژمارە (٩ـ ١٢)ی ساڵی ١٩٤١.

(١) قەسپە قەسپ: قاسپە قاسپ، خوێندنی نێرەکەو.

ئەوان بەسەرە ئەهێنییە بندار
ڕاوچی نوستووەو تۆ ئەیكەی هوشیار
بە دەماخی خۆی مشتیان لێئەگرێ
بە برینداریش سەریانئەبڕێ(٢)
لەجیاتی ئەوەی بۆیان بكەی شین
خوێنیان ئەمژی، ئەڵێیی ئافەرین
یا لەمەیدانا بە قین ئەخوێنن
كە تێكیشبەربوون یەكتر ئەشكێنن
خۆزگە ئەم حاڵەم لێئەبوو حاڵی
مێشكم لەم عیلمە نەدەبوو خاڵی!!...

كەو:

پۆڕە كچانی، واتە كناچە
ئەم قەومە ئێستا بوون دەسەپاچە(٣)
بەوان درابوو گەرمیان‌و كوێستان
ئێستاش دیارە دەورەی كەریم خان
ئێمەش لەكێوی كوردان خوڵقاوین
وەك ئەوان ئەژیین، هەرچەند داماوین
گەر خوێندەواری، تەئریخ ئەزانی
كردەوەی ئێمە بە باش ئەزانی(٤)

---

(٢) بە دەماخی خۆی: بە كەیفی خۆی.

(٣) كناچە: كچ.          دەسەپاچە: گێژدە، داماو، بێدەسەلات.

بە عەقڵبوایە خەڵقی ئەوروپا
هەرگیز نەیئەدی تەیارەو بۆمبا!!
ئێمە بڵێین چی لە کوردەی یەزدان
هیچکەس بە کۆشش ناگاتە کوردان

## یارەب بەحاجەت*

یارەب، بە حاجەت سەییدی سەروەر
کە بەشەرعی ئەو تاجمان نایە سەر
بڕە تۆ تەماع لەڕووی سەر زەمین
بەڵکو بە ئاسان ئەم خەڵکە بژین
هەر تۆ ڕازقی پیرو جوانی
ڕزگارمانبکەی لە دەست گرانی(1)
ئەوی ئەم شەڕو دەعوای کرد بەرپا
خوایە تۆ گەردی ئەو بدەی بە با
هەر ئەو خوایەی فیرعەونت خنکاند
مووسات بە ساخی لە ئاو تێپەڕاند
ئێستاش لای میللەت هەر ئەو قەرارە
عالەم بە قەهری کێ گرفتارە!

---

(٤) سەروا دووبارەیە.

* ژین، ژمارە ٦٥٤، ٢٢ی ك٢ ١٩٤٢.

(١) ڕازق: ڕۆزیدەر، بژێویدەر. گرانی: گرانیی سەردەمی دووەمین جەنگی جیهان.

خوایە بیکوژی زاڵمی زەمان
هیتلەر بووەتە بەڵای بێئامان
ڕەحمەت بێتەجۆش، شەپۆل پەیاپەی
وا ئێمە دەمرین، گەورەییت بۆ کەی!!
سا ونینەکەی، نەیدەی بە ئاوا
حەقی ئەم قەومەی، ناحەق کوژراوە
چەن هەزار مێشکی نەوجوانان پژان
بۆمبا پرژاندی، ئاخ، بە بێتاوان!...

## ژینی خۆشەویست *

ژینی خۆشەویست، چرای ئەم شارە
گەورەکان هاتنە غیرەت، ئەمجارە
ئەمە وننابێ لای پەروەردگار
ڕەحمی باوکییان بۆ هێنایە کار
بۆ ئەم کەسانەی سەردەقیان شکاند
لە وڵاتی دوور پارەیان گەیاند
بوو بە حەجێکی داخڵی خۆمان
بێڕەنجی ڕێگاو بێئەذیەتگەیان
هەر بەو کەلامەی کە دانراوە

* ژین، ژمارە ٦٥٥، ٢٩ی ک٢ی ١٩٤٢.

خـــــــێری ماڵان پێش مزگـــــەوت خـراوە
کــــــەعبە، کە بناغـەی نــــــــەبیی ئـانەرە
دڵ سەحەر گـاهی ڕەببی ئــــەکــــــــبەرە[(١)]
حــــــــاجی بـــــۆ زیـارەت دەچـێ و دێتەوە
پـــــارە بۆ برسـی ڕۆح ئەکــــــــــڕێتەوە[(٢)]
بــــــــەڵام خـوا حـەق غیرەتیکیان کـــــــرد
مـاڵی دنیـایـان بــــــــــۆ قـیامەت بـــــرد...

## یادی زانســـتی*

ڕۆڵـە خۆشـەویست، ئـــەی (نووری) بـــاقـی
زانسـتییەکمان بـوو، بـۆ زانین ســـــــاقـی[(١)]
ســــاڵی هـەزار کـەس، وەك من هیچ نــــەزان
تیایـا فێردەبوو، ئــەبوو بـــــــــە ئینسـان
شــــوێنی مەشـهوور بوو، بــــاخی میللـەتبوو
کـانـی ئــــــەدەب و دوور لە زیللــــــەتـبوو
وایان دانابوو کوردە گــــــــــــــەورەکان

(١) نەبیی ئاذەر: ئیبراهیم پێغەمبەر(د. خ) کوڕی ئاذەر، کەعبەی دروستکرد.
سەحەرگاهـ، دەمەو بەیان، بەرەبەیان. ڕەببـی ئەکبەر: خوای گەورە.
(٢) واتە ڕزگارکردنی برسی لە حەج گەورەترە.
* ژین، ٦٥٧، ١٣ی شوباتی ١٩٤٢.
(١) نووری: کوڕە گەورەی شاعیر. نوور: ڕووناکی و ڕۆشنایش. باقی، حاجی باقی: ناوی شاعیرە.

یادگار ئەبێ تا ئاخر زەمان،...

خوێندنی زانست بۆ مەعاش نەبوو

داخی بەجەرگم لە دەستمان دەرچوو

ئەو پیشانیداین شاە صەلاحەددین

تەمسیلی شیرین ئەو کردییە شیرین[٢]

ئەو مەم و زینەی بە بەیت ئەبێژرا

هێنایە بەرچاو، وەك شەوقی چرا[٣]

دوازدە سوارەی دەشتی مەریوان

زانست و ژیان هێنایە مەیدان

دەورەی بابان و شەریف چەلەبی

کێ لەیادیبوو، کێ بەخەو ئەیدی[٤]

تەمسیلی زانست هێنایە بەرکار

چلۆن ژیا بوون شێرانی هوشیار...

پارەو مەعهەدی زانستیان فڕاند

بناغەو بینای میللەتیان ڕووخاند

---

[٢] تەمسیلی شیرین: نواندنی بەتام و چێژ... نواندنی خوسرەو و شیرینیش ئەگرێتەوە، شیرین و فەرهادیشی پێئەڵێن.

[٣] بەیت: داستان و بەسەرهات بە هۆنراوە، لە کۆڕی شەونشینی و چایخانەکانا خوێندراونەتەوە.

[٤] شەریف چەلەبی: یەکێکبووە لەسەرۆکە ناودارەکانی هەمەوەند.

# ڕۆژێ عاجزبووم*

ڕۆژێ عاجز بووم، ڕۆییم بۆ گەڕان
تووشی پیرێ بووم، کەوتەی ناتەوان[١]
وتم ڕۆژت باش ئوفتادەی بێکەس
هەناسەی ساردت!! ماوە، ئیتر بەس[٢]
بۆچی خولئەخۆی بە ناتەوانی
کۆششتنەکرد تۆ بە جوانی؟!
جوابیدامەوە، بە زبانی شیرین
بە زەردەخەنەی نیوە پێکەنین
وتی لاوێکبووم، سەربەرزو پڕ شەوق
نەمزانی فەلەك ئەمخاتە ژێر تەوق
وامزانی زەمان زۆر وەفادارە
دائم لەگەڵ من هەر بەرقەرارە[٣]
نەمزانی دنیا بەسرِی، ژنێکە
بەخۆی دەڵێ کچ، کچ بێبنێکە[٤]
ماڵی چەند کەسی وەك منی شێواند

---

* ژین، ٦٥٩، ٢٦ی شوباتی ١٩٤٢.

[١] کەوتەی ناتەوان: پەککەوتە.

[٢] ئوفتادە: پەککەوتە، بێهێز.

[٣] بەرقەرار: بەردەوام.

[٤] لەڕوانگەی تەصەووفەوە، دنیا بەژنێکی خراپو بێوەفا لە قەڵەمدراوە، زۆر لە شاعیرەکان ئەمەیان بەسەرکردۆتەوەو هاندەرن کە پشت بە دنیا نەبەستێ چونکە بێنەمەك و هیچوپووچە.

هەزار شازادەی لە کیوان مراند...

............ ............ ............

خاڵە لە ئەسلاّ، لە کام مەردانی

بە جەوری دەوران وا سەرگەردانی؟

............ ............ ............

برا کوردێبووم، خاوەن سفرەو خوان

کۆچەڵ کۆچەڵبوو، ئەچووم بۆ کوێستان[٥]

ساڵێ مافەتە کەوتە حەیوانم

قڕی خستە ناو مێگەل‌و ڕانسم[٦]

جا بای نەدامەت ڕەشماڵی دڕی

دەوڵەتی جوانی لە دەستم فڕی[٧]

لە کەس‌و حاڵ و ماڵ بووم بێگانە

بە بێپارەیی ماڵم وێرانە

---

[٥] کۆچەڵ کۆچەڵبوو: کۆچی بەکۆمەڵ، ئاماژەیە بۆ کۆچکردنی گەرمیان و کوێستانی ئەوسا.

[٦] مافەتە: نەخۆشی‌و دەردو بەلاّ.

[٧] بای نەدامەت: وەیشومە، بای نەگبەتی. دەوڵەتی جوان: ئاژەڵی زۆرچاك. سەردەمی لاوی.

# یاخوا بەخێربێیت*

یاخوا بەخێر بێیت بەهاری دڵگیر
زۆری گرانی خستینیە زنجیر...
بەهار، ئەم قەومە دەردی گرانە
ئیتر بۆ هەژار مردن هەرزانە
خۆ کەس ناپرسێ لە دەغڵو لە دان
ئاخۆ لەبەرچی وا دەبێ گران!!
یەکەم بیانوویان خستبووە باران
بارانیش باری، زۆرتر لە جاران
باشە، وا ئەموال ماڵی جاپانە
چاوگەی فەلاحەت لەلای خۆمانە
نە لەشکر شێلای، نە سوارە خواردی
نە لەخەرماندا بۆمبا سووتاندی
بێتو ئەم حاڵە هەروا سەربگرێ
هەژار بە بەهار لە برسا ئەمرێ
نانەواو عەلاف بوونە غانیە
بە (هل من مزید) ناڵێن کافیە[١]

---

* ژین، ٦٦١، ١٢ی مارتی ١٩٤٢.

[١] عەلاف: بازرگانی دەغڵودان. غانیە: ژنی بەدخوو. (هل من مزید): ئەگەر زیاتر هەیە، بابێت .. ئایەتی قورئانی پیرۆزە، وەڵامی دۆزەخە بۆ یەزدانی مەزن، کە جێی زۆر ماوە بۆ خراپەکارو کافرەکان.

ئەو ئەنبارانەی لەپێشدا نووسران
کوانێ، چی لێهات، بەکێ فرۆشران؟!
دوو مانگە، گەنم ئەڵێن لەشار دێ
بڵێ (کەرەکە مەمرە بەهار دێ)!!

## نەورۆزت پیرۆز*

نەورۆزت پیرۆز، ئەی (ژین) ی سەربەست
یاخوا خاوەند و خۆت نەبن پەست
سەربەرزبێ قەومت لەڕووی سەر زەمین
نیشتمان بۆ تۆش ئەبێ دڵخەمگین
لە مانگی سێهەم، شەوی (بیست و دوو)
کاتێکمزانی ڕۆشنایی بەرزبوو[1]
ڕوانیم نەورۆزە، لە گردی یارە
تیا هەڵدەپەڕێ ئەهلی ئەم شارە
شوعلەی ئەو ئاگرە ڕۆژ ئەکاتەوە
نیشتمان لە خەم دوور ئەخاتەوە
سێ ساڵبوو ئاگری نەورۆز نەمابوو
دنیا بەئاگری هیتلەر سووتابوو
خوا بۆ ئەم خەڵکە کارێ بنوێنێ

---

* ژین، ژمارە ٦٦٣، ٢٣ی مارتی ١٩٤٢.

(١) شەوی نەورۆز، ٣/٢١ ئاگری نەورۆز دەکرێتەوە.

هیتلـــــــەرو نازی، (نـــــــاویان) نـــەمێنێ
ڕاپەڕن ئەهلـــی مەعـــــــــریفەت لـــــــــەخەو
داکـــــــــەنن بەرگی ڕەشی شـــــوومی شەو
نەورۆز قـــــــــدوومی خـــــــــێری بنوێنێ
خـــــــــەفەت وەك بەفری زســـــتان بشکێنێ[۲]
ئیـــــــــتر نـــەمێنێ خەمی گـــــــــرانی
بـــــــــا بڕێتەوە شـــــــــەڕی جیهانی
بۆ ڕۆژی جـــومعە، خۆشـــــــییانبێ و لـــــەتیف
بچینە ســـــــەیران کارێزی شـــــــــــەریف
ئیتر هەربـــــــــژی پیری پڕ هـــــــــــونەر
ئاســــــــار دیارو خاوەندی جـــــــــــەوهەر

## گۆرانیی فەسڵی بەهار*

بـــــــــــــەهـــارە، فەسڵی گـــــــــــوڵانە
ســـــــــەیری گوڵ بـــە تۆوە جـــــــــــوانە
ماچمــــــــــــان دەوێ، نـــــــــــەورۆزانە
بـــــــــــۆت دەمـــــــــــرم، ددان زێڕێ...
چـــــــــەند خۆشە، ســـــــــەیری ســـەرچنار!
پـــــــــــــــــەری تیـا دێنە لـەنجـەولار

---

[۲] قدووم: هاتن.

* ژین، ٦٦٥، ٩ی نیسانی ١٩٤٢.

ئاشق هەمووی دێنە هاوار
وەرە لام، ددان زێڕێ...
چوومە ناو باخ، بۆ سەیری گوڵ
گوێمڕاگرت لەناڵەی بڵبڵ
ئەیخوێند، بەشێوەنی پڕ کوڵ
بۆچ نەهاتی، ددان زێڕێ...
نەوبەهار خۆشی دەنوێنێ
کەو لەنزاران دەخوێنێ
ئاشقی هەژار دەگریێنێ
بۆت نەمام، ددان زێڕێ...
چوومە ناو باخ بۆ دیدەنی
گوڵ بە بلبل پێدەکەنی
وەفای وایە دنیای دەنی
لێتتۆراوم ددان زێڕێ...

# دەخیلتم ئەی بای*

دەخیلتم ئەی بای سوبح و ئێواران
ئەگەیتە گوڵشەن، سەیرانگای یاران
بڵێ بۆت ئەگرین دیدە خوماران
ڕەشپۆشن، وێنەی تەعزیەداران
سەرئاشی دەوران، دڵ ئاشەوانە
خوڵئەخوا لەدەست جەوری زەمانە
ئاخ، بۆ گوڵشەنی جوانی کوردستان
چۆڵە وەك شوێنێ کرابێ تالان
ئەو سەرچنارەی بەهەشتی سالان
بێنەغمەی بلبل، بێلەنجەی یاران
ئەم بەکرەجۆیەی بووبووە شارو باخ
ئەمساڵ نانوێنێ لەبەر ئاخ و داخ
تێکچوو سەیرانی چەمی تانجەڕۆ
شینئەکا، ئەڵێ خۆشیی جاران ڕۆ
حەیف بۆ گوڵاڵەی دەوری کانیبا
زەردو سوور تێکەڵ، سەرپۆش و عەبا[1]
ئاخ، بۆ سەیرانگای زانستیی کوردان

---

* ژین، ٦٦٧، ٣٠ی نیسانی ١٩٤٢.

(١) کانیبا: گردێکی بچکۆلەیە، کەوتۆتە بەردەم گەڕەکی قرگەی سلێمانی، گڵکۆی چاکییەکی خوای لێیە، تا ئێستاش چوارشەممان دەردەداران ئەچنە سەری بەهیوای چاکبوونەوە لە باداری.

دەنگی هەر بژی نایەتە گوێمان
ئاواتی بەرزی بۆ نەهاتەدی
بە گریان مەگەر تەڕبکا زەوی...
کۆئەبوونەوە بەشیعری دڵخۆش
ئەو سەیرانەیان ئەهێنایە جۆش...

## گۆرانی بۆ عەلی مەردان*

بژی ئەو خاکەی تۆ دەژیێنێ
نەژی ئەو کەسەی دڵت ئەشکێنێ،...
خۆشبێ زوبانی شیرین گوفتارت
خۆزگەم بەو کەسەی ئەبێتە یارت
گوڵ گۆنای تۆی دی شکا بازاڕی
نەما ڕەواجی شنۆی ڕوخساری
بلبل کە ڕوانییە ئەو پێکەنینە
وتی عەتری گوڵ کوا وا شیرینە!
بڕوانە، کە دی شەونمی ئەو چاوە
ئەلەکتریکی لەبیر نەماوە[١]
کۆترە عینوانی کە دیی عینوانت
ئەو لەنجەولارە، ڕەوتی جوانت[٢]

* ژین، ٦٦٨، ١٤ی نیسانی ١٩٤٢.

[١] ئەلەکتریک: کارەبا، لێرەدا مەبەستی گڵۆپە.

وتـــــــــــی تەرکبێ ئیـــتر لــــــــــەنجەولار
مـــــــــن لـەکوێ بێنم بەو ڕەنگە ڕەفـــــــتار[٣]
بـــــــــاز چاوی تۆی دی، چـــــاوی دانەوان
وتـــــــــــی بنازم بـە کردەی یـــــــــــەزدان
(بـــــــەنگـینە) بەسیە وەسفی چـــــاوی جوان
وەرگـــــــــەڕێرە سەر مەدحی نیشــــــــتمان...[٤]

---

[٢] کۆترە عیـنوانی: جۆرە کۆترێکی زۆر جوانە، بەهەواو فیزی خۆی ، زۆر ئەنازێ.

عینوان: هەواو فیزو بایبوون.

[٣] ڕەفتار: هەڵسوکەوت.

[٤] مەدح: ستایش.

# جوابی لایەلایەی ئامینەخانی ژنی قانع*

دایکــــی خۆشــەویست، ئـــــــــــامینەی زانا

شـــــــــــاعـیرەی کوردان، خــاوەن تەوانا[1]

لایــەلایـەکـــــــــەی گـــــــــەلاوێـــــژم دی

ســــپاستئەکەین فەلەك تـــــــــــــا زەوی

هــــــــەر بژی پـــــــــــیری بەرزی دڵسۆزت

ببیتە وانـــــــــە بۆ گـــــــــــــەل و هۆزت[2]

لـــــــــەداخی وەتـــــــــەن من چۆم ئەسرەوم

زیــــــــــاتر لە (کوتەك) بێزاری خــــــــەوم[3]

نـــــــەتخوێندۆتەوە پـــــــــەندی پێشـــــینان

ئـــــامۆژگارییەکـــەی پـــــــــــــیری دڵجوان!!

چــــــــەند هاوار ئەکا لــــــــــەگەڵی کــــــوردان

بــــــــــۆ بەرزبوونەوەی دایکــــی نیشـــــتمان

مــەڵــــــێ لایلایە (کـــــــــــــــوتەك) بخەوە

بـڵـــــێ، ڕاچــــەنە، کـــــــــــــــوتەك، مەسرەوە!!

ئــــــــــەشـێ لایـلایــەی دایکی وا دڵســـــۆز

---

* ژین، ٦٧٠، ٢٨ی مایسی ١٩٤٢.

(١) بێگومان هۆنراوەکە هی مامۆستا قانع خۆیەتی و بەناوی هاوســەرەکەیەوە بڵاویکردووەتــەوە، بڕوانــە گەلاوێژ، ژمارە (١ـــ ٢)، ساڵی ٢، ك٢، شوباتی ١٩٤٢.

(٢) پیر: ژیرو دانا ، لێرەدا بە واتای مامۆستا هاتووە.

(٣) کوتەك: کوڕی قانعە.

بـــا لـــەبەر بکەین، وەك شـــیعری نەورۆز
ماتـەمیی مـــــــن و گـــریانی کـــوتەك
ڕێیی گـــــەردوون بگرێ لـــــە داخی فـــەلەك
نەوەك هەر فــــــەلـەك، لــــە نیشتمانفرۆش
ســـا بەڵکو یــــــــەزدان ڕەحمی بێتەجـۆش
ئـــــــەوەی خـــائینە بە خاکی کـــــــوردان
چـــــــاوی هەڵنەیە ببینێ جــــــــیهان
ئـــــــــەم هۆنراوەیەی (نەسرین بەنگـــــینە)
جـــــــوابی گەلاوێژ، دەســــتکردی ژینــــــە[٤]
یـــــــــاخوا هەر بـــــــژی ژین و گــــــەلاوێژ
بـــــۆ خاکی وەتـــــــەن بوونە گـــــــولاوڕێژ

---

[٤] نەسرین: کچی بەنگینەیە ، لەسەر ڕێڕەوی مامۆستا قانع ، ئەمیش بەناوی کچەکەیەوە هۆنراوەکـەی نووسیوە.

# کوردو گۆران*

**گۆران:**

کـــــــوردە مژدەبــێ، ئەچیتە کـــــــوێستان
شـــــــــاد ئەبیتەوە، تـــــــــۆ بە کـەلیخان
دەمبنێ نـــــــــــاو دەم کـانیی دەلـــــۆران
بـــــا بیشـــــواتەوە دڵگـــــــــیری و هیجـران[(١)]

**کـــــــــــورد:**

گـــــــۆران، ڕاســـتبێژە، خـــــــەوە ئـەیبینی!
گـــــەمەم پێمەکە، لـــــەسـەر کــــــــــام دینی؟!
ئێســـــــتا بێگانەی کڵاو کــــــــــــــــــەلارە
ڕێوازیـــــان چۆڵکرد بـۆ ئـــــەم بەهــــــــارە[(٢)] .!...

**گـــــــــــۆران:**

کـــــــوردی درێژەدڕ، بچـــــــۆ بـــــــــۆ ئێلاخ
وەرگـــــــــــرە هەوای گیانبەخشی لـــــــــەیلاخ

---

* ژین، ٦٧١، ١١ی حوزەیرانی ١٩٤٢.    کورد: بەکۆچەرو ڕەوەند گوتراوە.
گۆران: بەنیشتەجێی شارو گوند گوتراوە.
(١) کانیی دەلۆران: لەسەر سنووری ئێراق و ئێرانە، سەرەڕێی جافبووە.
هیجران: دووریو لەیەکدابڕان.
(٢) کڵاو کەلارە: جەندرمەو ئەمنیەی ئێران.    ڕێواز: ڕێباز، شوێنی دەرچوونو پەڕینەوە.

بڵێ، دەمێکە ڕێم لێگیراوە
یەك ئاژەڵو یەك حەیوانم ماوە

کورد:

گۆران ڕاستبێژی، حەکیمی حاڵی
خۆشمزگێنیبیت، یاخوا نەناڵی
برا بەسیوێ، مەیکە وە گالاّ
سەبۆر بۆ کوێستان ئەمشەو ئەینالاّ[٣]
شەوەکی سەبۆر ڕوویکردە، ئێران
جارجار ئەوەڕی، جارجار ئەیقۆڕان
وتم، ئەی سەبۆر، قەزات لە ماڵم
منیش بۆ بەفراو، چوون تۆ ئەناڵم

گۆران:

کوردە، لەباسی سەگەل بگەڕێ
ساڵ وا درەنگە، وەختە تێپەڕێ
ئێستا خوێڕە، لە بڕنەو بەشان
تۆ دوا مەکەوە، با نەکرێی تالاّن

کورد:

کورد وتی، باشە ناچمە هەورامان

---

[٣] بەسیوێ: بەسیبێ. گالاّ: گاڵە، هەرا. سەبۆر: سەگەبۆر. ئەینالاّ: ئەینالاّند، ئەوەڕی.

ڕێگر پەیدابووە، نەوەی جافرسان[٤]
لەبیرمان نەیەت بەندی (ڕەزاخان)
ئینگلیز نەبوایە هەر دائەڕزان[٥]
ڕزگاریکردن، ئەوان لە تاران
لەژێر شەللاقی قازاخی ئێران[٦]
با وجوود ڕێگامان لە کەلیخانە
(ژین و گەلاوێژ) پێشڕەومانە
سەر شیوی سەقز ڕاگوزەرمانە
مێژووی ئەمین زەکی چاویلکەمانە[٧]

## پەیڕەوی*

ئەم پەیڕەوییەی پەندی پێشینان
بۆ گەلاوێژی بەرزی ئاسمان

---

[٤] جافرسان: جەعفەر سوڵتان، سەرۆکی بەگزادەکانی هەورامانی لهۆن، لە هەموو سەرکردەی بەگزادەکانی ئەم ناوچەیە بەهێزتر، بە دەسەڵاتتر، داناترو دادپەروەرتر بووە، پیرەکان زۆر باسی داوێنپاکی و دلێریی ئەکەن.

[٥] ڕەزاخان: ڕەزاشای ئێران، کە بەرەی هاوپەیمانان، لەدووەمین جەنگی جیهانیدا، ئێرانیان داگیرکرد، هەموو دیلەکانیان بەردان، بەگزادەکانی لهۆنیش، زۆریان لە بەندابوون، ئەوانیش ئازادکران، شاعیر ئەم کارەش بە دەستەگوڵی ئینگلیز ئەژمێرێ.

[٦] شەللاق: قامچی.          قازاخ: جەندرمە.

[٧] چاویلکەمانە: دووربینمانە.

* گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٩و ١٠)، ساڵی ٣، ئەیلوول و ت١، ١٩٤٢.

ئەی گەلاوێژی بەرزی شاخەکان
تەئریخی تازە، چیرۆکی کوردان
ئەگەر لە حاڵی دنیا ئەپرسی
بۆ ئاگای نییە لە حاڵی برسی!...
ئەو کردەوەیە جوان نییە بۆ بەشەر
تۆوی نیفاقە تا ڕۆژی مەحشەر
بەڵام هەندێ کەس ئەونە هوشیارە
لە حاڵی برسی زۆر خەبەردارە[1]
چونکە ئەزانێ چەرخەکەی دەوران
وا لە گەڕانا، لە ئەرزو ئاسمان،
هەندێ کەس هەیە لای خەڵك کەمە
چونکە کردەوەی جەورو ستەمە!!
ئەوی زانابێ هەر ئاگادارە
خۆی لێناگۆڕێت، دائیم هوشیارە
ناکاتە کارێك پێیبڵێن، مەستە
تازە خۆی دیوە، جا چ دەربەستە!![2]

---

[1] ئەونە: ئەوەندە، هێندە.

[2] تازە خۆی دیوە، تازە پێگەیشتووە، هەتیوچە. چ دەربەستە: گوێنادات هیچ، بێباکە.

# سوپاس و بەسەرهات*

ئەم ڕەمەزانە، لە شاری بەغدا
نزیکبوو دڵم شێت ببێ، شەیدا
خۆمم چۆن ئەدی!، زۆر بە بێکەسی
دڵ بە خەمباری، ڕۆح بێنەفەسی[1]
بەدەم دەردەوە، دڵ پڕ لە گریان
ئاهم هەڵکێشا، بێخاوەند ژیان
هاوارمکردە شەماڵ، زریان هات
وتی، کوا کەسێ بگاتە فریات
هەرچەند ئەمروانی بەبێ (پیرەمێرد)
هەناسەم سواربوو، دەروون پڕ لە دەرد[1]
خەیاڵ پێیوتم: بەغداد پڕکوردە
بەڵام کوردێکیان بە ڕاستی گوردە
ئەگەر بەکۆشش تۆ ئەبی ڕازی
خۆت بگەیەنە جادەی (ئال وازی)
هەڵسام، ڕۆیشتم، بە دڵێکی تەنگ
هەروەك زۆر بگیر، ڕابکا لە جەنگ
سوڵتانی ئەشقی میللی پێشمکەوت

---

* ژین، ٦٨٩، ١٢ی ت٢، ١٩٤٢.

[1] بێنەفەس: بێهەناسە.

[1] لەجیاتی (پیرەمێرد) (پیرەمەرد) بوایە، واتاکەی هەروەکو خۆی ئەبوو، کێش سەرواش ڕێکتر ئەبوون.

ئەوێی پیشاندام، جا دڵم سرەوت
خۆم بەخۆزانی، نەوەك بێگانە
بەزڕەی زیلە دام لە دەرگانە
ڕوانیم دەرپەڕی، سەربەست، مەردانە
وتی: بفەرموو، چی داواتانە !
وتم بەنگینەم، کەوتمە تەنگانە
هاتمە لای پیاوێك، هیوای پیاوانە،
چوومە دیواخان ئەو نەوجوانە
تەشریفی هێنا، زۆر بە مەردانە
سەرگوزەشتی خۆم بۆ گێڕایەوە
بەڵێنیدامێ، بەو هیوایەوە،
بەیانیم لێهات کاتێکم زانی
ئێمەی خستە ڕێ بۆ سلێمانی...
سوپاسیئەکەین بەدڵێکی پاک
یاخوا هەمیشە سەربەرزبێ و بێباک
بەو ئەستێرەیە ڕۆژمان سەعیدە
بۆ هاونیشتمان نەویدی عیدە[1]

---

[1] سەعید، بەختیار، نەوید: مژدە. عید: جەژن.

# مەڕو شوان*

**مەڕ:**

ئەرێ خاوەنی وریاو هوشیارم
ئاگادارمبە، دڵبریندارم
باش بڕوانەرە شێوەی گوفتارم
چاوەڕوانی تۆم، لە خەڵك بێزارم
هیواداری تۆم، بە تۆ ئەنازم
ئاواتی بەرزیی خاکت ئەخوازم
شوانێکی باشبە، باشم بەخێوکە
زۆر لێم وریابە، بێخێوم مەکە[1]
پێستم مەفرۆشە شیرەکەم بخۆ
گیانم پێبێڵە، مەمکە ڕەنجەڕۆ
بە گورگانخواردووم مەدە، کە بمخۆن
خورییەکەم جوانە، بیکە بە فاسۆن
باتەرەنەبم، بکەومە کێوان
ماستەکەم بخۆ، بەرچای بەیانییان
ڕۆنەکەم لەگەڵ برنجی گوێ چەم
بیکە بەپلاو، بیخۆ، بە بێخەم

---

* ژین/ ٦٩٠، ١٦ی ت٢، ١٩٤٢.

(١) بێخێو: بێخاوەن.

مەدحی ئیرادی خۆم بکەم بەیان
شانامەیەکە، ئیثباتی جیهان...[٢]

شوان:

مەڕە جوانەکەم، شوێنت کوێستانە
خاکەکەت شوێنی شێرو مەردانە
جێگە شکاری پاشای بابانە
یا جەولانگاهی شای کەریم خانە[٣]
خوا وایکردووە بۆ ئەم خاکەی تۆ
هەموو پڵنگن، وان لە جستوجۆ[٤]
ئێوە مەڕمانن، دەورتان چەقەڵ
گورگ و چەقەڵتان ئەدەینە بەر پەل
هەندێکتان وێڵی دوای گورگە بۆرن
شیر بۆ شێر نادەن، کەری خۆ خۆرن

---

[٢] ئیراد: داهات.        بکەم بەیان: باسبکەم.
[٣] شکار: ڕاو.        جەولانگاه: مەڵبەندی ڕاو و شکار و سەیران.
شای کەریم خان: کەریم خانی زەند.
[٤] جستوجۆ: جموجوڵ، بزووتن.

# سوپاس بۆ ئێوه*

سوپاس بۆ ئێوه، ئەی براکانم
خزمەتتانئەکەم، هەتا ئەتوانم
لەئێستگەی ڕادیۆ، لە سلێمانی
دوعای خێرئەکەین بۆ بەریتانی!![1]
ئیتر هەربژی کوردو کوردستان
ڕسگاربین لەدەست جەهل بە ئاسان
یەکیەتیی کۆمەڵ ئیتر بینوێنێ
بەڵکو گرانی وازمان لێبێنێ...
کوردە، تاماوی ئاوات بخوازی
بەشکم نەمێنێ کۆمەڵی نازی
ئێمەش کوردستان جێی ئاواتمانە
خزمەتی لەسەر دووچاوانمانە
دەخیلە کوڕگەل، بۆ کورد بەیانە
حەیفە بێنار بێ ئەم خاکە جوانە[2]
سوپاستانئەکەم، (بەنگینەی باقی)
ئەم چەند فەردانەم بۆ دەستی ساقی

* ژین، ٦٩٣، ١٧ی ك١، ١٩٤٢.

(١) ئینگلیز لەسەردەمی دەسەڵاتیدا ئامێرێکی بێتەلی کردووە بەئێستگەیەکی ڕادیۆ، ڕۆژانە بۆ ماوەیەك بەکوردی بەرنامەی بڵاوکردۆتەوە.

(٢) بێنار: بێدڵسۆز، بێدۆست.

بەڵام کـام سـاقی!! بـادەی عـیلمنۆش
بـۆ وەتـەن دائیم دڵی بێتەجـۆش

## پیری دڵسۆز*

پـیری دڵسـۆزی چـرای کـوردستان
زیندووکـەرەوەی ئـاثاری کـوردان
بـەجووت مژدانەی بەهـاریـان هـاورد
لەشـکری (نـازی)ش شکا، دەسـتوبرد(١)
ڕۆشـنایی دڵی شـەوقی نـاو گـوڵزار
سـەیری بەهـارە، دیـارەو دیـار
پـیرەکەی دڵجوان، خـاوەندەکەی ژیـن
بـانگکە، چـۆپیکێش تیپی نـازەنین
لـەسـەر خـاڵی ڕەش، وەك لاوی سەرخۆش
یـەك بـە بـۆنەی یـەك ئەکـەون بێهۆش
شـای گوڵ، گوڵەباخ، شـەوقی ناو چیا
بلبل بـۆی ئەگری، قومریش بـە جیا،
ئێمەش بەمجـۆرە، بـۆ نیشـتمانمان
لـەو وتە جـوانە نابین پەشـیمان
گـوڵزاری ئێمە هـەر نیشـتمانە

---

* ژین/ ژمارە ٧٠٠، ڕۆژی ١٨ی مارتی ١٩٤٣.

(١) بەجووت: پیرەمێردو ژین. هاورد: هێنا. نازی: پارتی نازی ئەڵمانی.

شـــــۆخ و شـەنگیمان هـــــــەر کـــــوردســـــتانە
بـــــــــۆ هـــــــەموو خـاكو ولاّتی کـــــــــوردان
بـــــــــۆ جێگەو شــــوێنی بەبەو کـــــەریم خان

## نەوبەهار*

مـــــژدە بـــێ وەتـــــــــەن وا نـەوبـەهـــــــارە
شـــــەوقی ئـــــــاگـــرەکـەی نەورۆز دیــــــــارە
وەك شـــەوقی تـــاجـی پادشــــــــــــای جەمشـید
ئەدرەوشــــــێتەوە بــــــــــۆ هـیواو ئــومید
ئــــــەو ئاگـرە هەڵســــــا لە گردی یــــــــــارە
قاســــپە قاســــپی کەو لە تـــەکیا یــــــــــارە
ئــــــــاگری لـــە لـــوتکەی هـــەردی کوردســــتان
بـــە قاسـپە ئــەڵێ بـــــــــــــژی کوردســــتان
وا چنوور لـەســــــــەر چیـــــــــــــــــا پــەیدابوو
ئاشـقی وەتــــــــــــــەن دڵی شـــــــــــەیدابوو
بلــبـل لــــــــــــە خۆشیا گــــــــــــەردن هەڵدێنێ
بێپـــەروا بەســـەر چـــــــــــــــــــڵدا ئــەخـوێنێ
ئـــەڵێ چەند خۆشە بــــــــــاخـی کـــوردســـــــتان
بۆ کچە کـــــــوردو پۆلــــــی چاو مەســـــــــــتان

---

* ژین، ۷۰۲، ۱ی نیسانی ۱۹٤۳.

چـــیمەن ئـــــەبێتە فـــــەرشی دیـــــــاران
زۆر چـــــاوەڕێیە بـۆچــــوونی یــــــــاران
ســـــاخوا لـــەم ســـــــاڵە ڕەشـە ڕزگاربـــین
لــــەگەڵ ســـــــەیرانا لێك ئـــــاشكاربـــین[1]
گـــــولاڵە ســـــــــوورەی جـوانی ســــەرزەمین
بـــــا ئەیشەكێنێ، ئـــــــەڵێ كـورد ئـــــەژین
ئــــــــەرخەوان ڕەنگــی بـــــۆیە وا ســــــوورە
زوو دێتە مـەیدان، وەك كــــــورد جەســـــوورە[2]
چــــــنار وەرئـــــــــەگرێ هــــەوای كــوردستان
هــێندەی تر بـەرزە، ڕووبەڕووی ئــــــــاسمان

---

[1] ئاشكار: ئاشكرا

[2] جەسوور: ئازا، چاونەترس، نەبەز.

# گردەکەی یارە*

ئۆخەی گردەکەی یارە
چەند شیرین و نازدارە
ئەو کاریزەی لەبەرپێی
ئاوی شیرینی شارە...
بۆیە هێندە جوانی
جێی نەورۆزی کوردانی
سەیرانگەی بەهارانی
جێی ئومێدی لاوانی،...
ئاوی خۆشە وەك شەکراو
ڕووناکە، ڕووناکیی چاو
لە گۆیژە دێتەخوارێ
شوێنی کۆڕی لاوانە، ...
وەرن با بچینە سەیران
وا ڕزگاربووین لە زستان
یا خوا بژی بە شادی
هەموو خاکی کوردستان...
وەرن کۆمەڵی لاوان
لێیبکەن جەژنە پیرۆزە

* ژین، ژمارە ٧٠٤، ٢٢ی نیسانی ١٩٤٣.

ڕۆژی چوارشەمموی بەهار
پڕ لە جوانی دڵسۆزە،...
زەردو سوور تێکەڵدەبن
وێنەی گوڵی سەرچنار
ئەبێ بە شادمانی
بۆ گەلی کوردی هەژار،...
تو خوا بەسیە گرانی
مایەی فیتنەی جیهانی
بەهارە، خاکمان خۆشە
بەهەشتە سلێمانی،...
کۆمەڵی یاران کۆبێ
بەس باسی گەنمو جۆ بێ
شیعری مەولەوی خۆشە
(ڕەشۆڵ) بەچریکەی تۆ بێ...[1]
گوڵزاری سەرزەمینە
چەندە جوانو شیرینە
یاخوا بژی بە شادی
ئەم وڵاتە ڕەنگینە،...
یاخوا بژی نیشتمان

[1] بەنگینەی شاعیریش پیرەمێرد ئاسا، پەنایبردووەتە بەر ڕەشۆڵ بۆ ئەوەی بچریکێنێ.
ڕەشۆڵ: هونەرمەندو مەقامبێژی ناودار، چریکەیەکی زۆر بەهێزی هەبوو. بەدەنگە خۆشو زوڵاڵەکەی، ئەم هۆنراوەیەی بەئاوازێکی زۆر جوان چریکاندووە. تاکو ئێستاش لە ڕادیۆ کوردییەکانەوە، ڕۆژانە ئەبیسترێ. پیرەمێردی نەمریش زۆر پێی سەرسامبووە.

ڕێوشوێنی زانای کوردان
ناوی ئازایی ڕۆڵەت
ماوە لەدانگەی مەیدان...[٢]
لە کوولەکەی تەڕا کورد
هیچکەس ناوی نەدەبرد
ئینگلیز پشتیوانییکرد
وا هاتە ناو دەستوبرد

## مژدەی سەرکەوتن*

مژدەی سەرکەوتن گەیشتە گوێمان
خۆشی بۆ ئێوە گەلی نیشتمان
توونسی بەجێهێشت نازیی، بێنازی
هیتلەر ئاواتی مەرگی ئەخوازی
ڕۆمێڵ بەرقیەکەی وا دا بە بەرلین
لەشکرمان شکا، ئێوە چۆن ئەژین!![١]
وتی توونسیش دەرچوو لە دەستمان
لە ئەفەریقا نەما بەیداخمان

---

[٢] دانگەی مەیدان: لەگەرمەی کۆڕا! ناوجەرگەی مەیدان.

* ژین، ٧٠٧، ١٣ی ئایاری، ١٩٤٣.

[١] ڕۆمێڵ: ئەفسەری ناوداری نازی، فەرماندەو سەرلەشکری ئەڵمان لەبەرەی ئەفەریقادا، لە دووەمین جەنگی جیهاندا.

جوابی بەرقیەکەی نەدرایەوە
ئێشی برینیان وا کولایەوە
جەنراڵ ئەلکسەندەر کەوتە هەڵمەتدان
لەشکری (نازی)ی لەتوونس دەرپەڕان[٢]
ئنجا ئەوانەی ئەڵمانیان ئەوێ
ئیتر خورپەیان لە دڵ دەکەوێ...
کوردە فیداتبم تۆ دڵ مەگۆڕە
لەمە بەولاوە جەژنی سوێندخۆرە[٣]
ئیتر لەمەولا هەر حەوت ڕۆژ جارێ
ئەدرێ مژدانەی گرتنی شارێ...
هیتلەر، کوا لەشکری دڕی بە گوڕت!!
کوانێ دەبابەی (ماجیت)و پڕت!!
کوا هاتو هووتی ناو ڕادیۆکانت
کوا پەڕەشووتی جاری جارانت!
نەمگوت کە ئینگلیز ئاخری (ئەتکوژێت)
بەس خوێنبمژە، خوێنت ئەمژێت!!
کوانێ هات هاتی دنیا گرتنت!
کوا شیری خوێنی ناحەقڕشتنت!!
(دەقەن دوقەنە) فەرموودەی یەزدان

---

[٢] جەنراڵ ئەلکسەندەر: سەرلەشکری بەرەی دەوڵەتانی هاوپەیمانان.

[٣] سوێندخۆر: دەوڵەتانی هاوپەیمان، ئینگلیز، فەرەنسا، ئەمەریکا، شۆرەوی، دژ بە بەرەی نازی و فاشست لە دووەمین جەنگی جیهاندا.

ئه‌مجا ڕاكردن بووه‌ته خه‌ڵاتتان... [٤]
له پیره‌مێردیش مژده‌مان ئه‌وێ
سه‌یری كارێزی شه‌ریفمان ئه‌وێ...

## به شه‌ماڵدا نامه*

شه‌ماڵ فیداتبم، وه‌ره هاوینه
تاوی گه‌رمایه‌و دڵ پڕ برینه
گوڵی باخچه‌ی دڵ سیس و خه‌مگینه
چڕه‌دووكه‌ڵی گه‌رمایه، شینه
خه‌یاڵ وه‌ك زوڵفی خاڵخاسان خاوه
لای خۆی تاڵێكی سه‌د هه‌زار داوه
ئێستا له تاوا، تاوی نه‌ماوه
به ئاهی ده‌روون په‌ست و شێواوه
مه‌گه‌ر به‌شه‌وقی گه‌لاوێژی شه‌و
چاوی نێرگسی هه‌ڵبێنێ له‌خه‌و
یا مه‌گه‌ر شوعله‌ی ڕۆشنایی ژین
بێ به ئاوێنه بۆ ڕوخساری ژین
یار به‌ڕووناكی چاوی هه‌ڵبێنێ
وه‌ك جامی جیهاننما بنوێنێ

---

[٤] ده‌قه‌ن دوقه‌نه: ئاماژه‌یه به‌م په‌نده مه‌زنه (من دَقَّ دُقَّ): هه‌ر كه‌س له‌ده‌رگای كه‌سێ بدات، له ده‌رگای ئه‌درێته‌وه، هه‌ركه‌س هه‌رخراپه‌یه‌ك بكات دێته‌وه ڕێی، په‌نده، نه‌ك وته‌ی خوای مه‌زن.

* ژین، ژماره ٧١٩، ساڵی ١٧، ١٦ی ئابی ١٩٤٣.

# یادی ئاواڵێک*

کەوە جوانەکەی خاڵومیێل ڕەنگین
هەر لەخۆت ئەهات قاقای پێکەنین[(١)]
هەرچەند ئەتقاسپاند بەری بەیانیان
شۆرێکی تازەت ئەخستە ناومان[(٢)]
مەجلیس بە تۆوە نەشئەی خۆشئەبوو
یاران بەتۆوە بادەنۆشئەبوو
تۆ وەك تاری عوود، ڕادیۆی شەومبووی
مایەی وریایی و مەستیی خەومبووی
بەهاران بە کوڵ ئەتخۆند لە هەردان
ئەبووی بە مایەی زەمزەمەی کوردان
هەی داد، چریکەت لە گوێم بڕاوە
بە ئاگری دووریت جەرگم بڕاوە
چی بکەم، چی بڵێم، عەشرەت هاوارە !
کەویان تەراندووم، جەرگم زامارە
هێلانەی دڵم وا کشوماتە
زیندەگیم لەڕێی هات و نەهاتە[(٣)]

---

* ژین، ژمارە ٧٢٢، ٩ی ئەیلوولی ١٩٤٣.ئاواڵ: هاودەم، هەڤاڵ، هاوڕێ.

(١) قاقبەقاق و قاسپەی پڕ نەشئەو جۆشی بەقەکەی ــ نێرەکەوەکە ــ چواندووە بە قاقای پێکەنینی شادی و خۆشی.

(٢) شۆر: ئەوین، ئەشق.

هەروەك حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە
شینی بازی کرد، ئەوەم لەبەرە
بە قووقوو، هووهوو، شەو ئەناڵێنم
فرمێسك ئەرمئەکا سەنگی باڵێنم(٤)
سا خوداوەند زوو بەرتدا لە داو
قاسپەت دەوابێ بۆ جەرگی کەواو

## جەژنە پیرۆزە*

ژینی خۆشەویست چرای نیشتمان
ڕۆشنایی چاوی وردو درشتمان
بنووسە جەژنە پیرۆزی بۆمان
هەم سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان
چونکی ئەم جەژنە دوو جەژنە، قوربان
گرتنی ڕۆما، مەرگی ئەڵەمان
ئەڵێن ژاپۆنیش سەربەرەوخوارە
ئەویش هەر ئەمرێ، چاری ناچارە
کە دیموقراتیی خستە ناو دنیا
ئەشێ هەر بژی بەریتانیا

(٣) زیندەگی: ژیان.
(٤) سەنگ: بەرد. باڵێن ـ باڵین: سەرین.
* ژین، ٧٢٥، ٣٠ی ئەیلولە ١٩٤٣.

جـــــا فـــــــــەلەك دەوری کــرد بە دووبـــــارە
جـــــــەژنی دوو جـــــــــەژنی خستە ئەم شـــــارە
هیتلـــــەر نـــــــاو ئـەبەین بە ئیتلەر، وەك ســـەگ
کـــــوردی نـــــــاو نـــابوو جوولەکەی بێچــــــەك!!
لـەمە بـــــــــــــــــەولاوە، ڕۆژێ ژیـــــــانە
وەتـــــــــــــەن دڵشــــــــادو، دوژمن گـــــریانە

## نەورۆز*

نەشئەیی نەورۆزە، وا دڵ ئارەزووی سەیران ئەکـــا
ڕەنگی ڕەندو پڕتەوی ئەودەشتە پیاو حەیرانئەکـا[1]
ڕووبکەرە ئەم شارەزوورە، نەرگس و لالـەو چەمـەن
وابەیەکدا هـــــاتووە، شـیوەی بتی ڕەقسـانئەکـا[2]
هەر لەڕێی بالأنتەران، تا میری سوور، ئـەو ناوچەیە
وەك بەهەشتی سەرزەمینە، جێگە بۆکوردان ئەکـا[3]

* ژین، ژمارە ٧٣٦، ٩ی مارتی ١٩٤٤، ئەمە تاقە هۆنراوەی شاعیرە بەشێوەی عەرووز و ستوونی دارێژرابێ، ئەم هۆنراوەیە زۆرتر سەرنجڕاکێشێ، چونکە بەڕاستی توانـاو سـەلیقەیەکی شاعیرانەی زۆر جوانی تێدایە.

(1) نەشئە: جۆش و تین، هەواو تاسە. ڕەند: جوان. پڕتەو: شەوق و تین.
حەیرانئەکا: سەرسامئەکا.

(2) نەرگس: نێرگز. لالە: گوڵاڵە سوورە. چەمەن: چیمەن، مەبەست لە دەشتو هەردی سەوزە.
بتی ڕەقسان: نازداری خەرامانو بە لەنجەولار.

(3) بالأنتەران: شوێنێکە لەنزیك گوندی کانیپانکەی شارەزوور.

هەر بەڕیز، ڕووباری ئەودەشتە، لەگەڵ بەندی سەراو
ئاوی سوبحانە، نمووشی صنعەتی یەزدان ئەکـــا[٤]
هەفتەیەکی تر، خودا یـــــار بێ، گەر نەورۆزهاتەوە
ئـــاگری سەرگردی یارە، ڕووی هیوا ڕەخشانئەکا[٥]
ئەو کەسەی ئەم جەژنی کوردەی لا گرانبوو، جاڕسە
ئێستە بێپەردە، لە زۆڵی، گەورەیی شەیتان ئـــەکا[٦]

## نەورۆزو باران*

نـــەورۆزو بـــــــــاران، نەورۆزو بـــــــــاران
خۆشـــــــی و ئاسایش بۆ دۆست و یـــــــاران
دڵـــی گەلـــی کـــــورد تـــەنگ و ناســــــــازبوو
گـــــوڵ و ســــــەوزایی گشــتی بێنـــــــــازبوو
بۆ ئـــــــاوو بــــــــاران ئـــاواتەخـــــوازبوو
هـــیوای بــەزەیی خــــــوای کارســـــــــازبوو
بـــــــــاران ببــــــارێ و خـــــەلـــە پێبگـــــا

---

میری سوور: گوندێکە لەبناری شارەزوور، سەربەشاری سەیدسادقە، (چاکیی میری سوور) زۆر ناودارە.

[٤] بەندی سەراو: گۆمی سەراوی سوبحان ئاغا، لە پاڵ سەی سادقدایە، کشتوکاڵی زۆری لەبەردا دەکرێ.
سوبحان: یەزدان، سوبحان ئاغاش دەگرێتەوە. نمووشی صنعەتی یەزدان ئەکا: شێوەی کارو بەرهەمی یەزدانی گەورە ئەنوێنێ.

[٥] ڕەخشانئەکا: ئەدرەوشێنێتەوە، ئەگەشێنێتەوە.

[٦] لا گرانبوو: پێی سەخڵەتبوو، پێی ناخۆشبوو. جاڕس: پەست، وەڕس، بێزار.
بێپەردە: بێپێچ و پەنا: یەکەو ڕاست.

* ژین، ٧٣٧، ٢٨ی مارتی ١٩٤٤.

دڵی گرانجان بە ئاواتنەگا[1]
لەسەر فەرمانی جەنابی باری
لەهەموو لایەك وا باران باری[2]
گیانلەبەر، پاکی ئاهی تێگەڕا
گرانجانەکان پرزەیان بڕا[3]
لەزەوی‌و ئاسمان پیرۆزی کرا
کە کورد ئاگری نەورۆزی گڕا
تیشك‌و بڵێسەی گەییە ئاسمان
ئاشکرا، دیار، ئەیوت بەزبان
بژی کوردستان، بژی کوردستان
بۆ ئازادیی تۆ بڕوا گشت کەسمان
ڕۆڵەی زانست‌و ئەندامەکانی
هەمیشە بژین بە شادمانی
بە خوێندەواری کە نیشتمانی
ئەپارێزێ جوان بە دڵ‌و گیانی
ئەوی چراکەی هەڵدەگیرسێنێ
تەنگوچەڵەمەی هەرگیز نەمێنێ
ئەوانەش کە وا زانستیان ناوێ
ناویان هەڵگیرێ لەناو گشت ناوێ

---

[1] خەلە: دەغڵ‌و دان ، گەنم‌و جۆ، دانەوێڵە.
[2] باری: خوا.
[3] پاکی: هەموو. پرزەیان بڕا: زیرەیانکرد ، شوێنەواریان نەما.

# پەیڕەوی ڕۆڕۆی زانستی*

(خاڵە) خوێندمەوە ڕۆڕۆی زانستی
زۆر بەرز ئەفڕیم کەوتوومە پەستی[(١)]
ئێشی برینی کۆن کولایەوە
بۆ زانست ئەگریم بەلایلایەوە
بۆ ئەو زانستەی چرای کوردانبوو
ڕێ ڕووناککەری دەستەی لاوانبوو
کوژاندیانەوەو، خوا کوێریکردن
چاو بەرەوژێرو بێخێریکردن
باخێکی کورد بوو، بەعیلم ئاوابوو
گوڵخونچەی ژینو ژیانی تیابوو
هاوار ئەبەینە بەر بەهای پڕ نوور
بە نووری مەیلی ئەو دەبین مەسروور[(٢)]
ئەو زانستییەی، کە ئەیخەملانین
پۆلی شاعیری بۆ پێگەیانین[(٣)]
چەند کتێبخانەو مۆبێلی گران

---

* ژین، ٧٤١، ١١ی مایسی ١٩٤٤... شاعیرمان ئەم هۆنراوەیەی بەبۆنەی داخستنی قوتابخانەی زانستییەوە داناوە، شایانی باسە دوای ئەوە قوتابخانەکە کراوە بەقوتابخانەی میری.

(١) خاڵە: مەبەستی پیرەمێردی نەمرە.

(٢) بەهای پڕ نوور: یەزدانی گەورە. مەسروور: شاد.

(٣) ئەیخەملاندین: ئەیگەشاندینەوە.

شەش پەردەی تەمسیل، حۆقەی سەوزی جوان[٤]
بەپارەی دەستەی تەمسیل کڕابوو
نازانین بۆچی و بۆ کوێ بڕابوو
دوای تێڕۆهاتن، سووکێ، بێپرسێ
وەیان زانیبوو کەس لێناپرسێ[٥]
پیرەمێرد، نەمر، دوای کەوتە هاوار
هاواری کەوتە بەرگوێی گەورەی شار
ئەو ڕۆڕۆیەتی ئێمەش لە شوێن ئەو
ئەگرین بە ناڵین، بەڕۆژو بەشەو
ناڵەمان گەییە بارەگای یەزدان
فەریادڕەسێکی ناردووە بۆمان[٦]
حەقی ئەم غەدرو زۆرە ئەسێنێ
مریشکمان لەدەم چەقەڵ دەردێنێ

---

[٤] حۆقە: قوماشی گوڵحۆقە، جۆرە قوماشێکی جوان‌و گوڵ گەورە بووە، لەبەر گەورەیی گوڵەکەی وتراوە گوڵحۆقە.

[٥] تێڕۆهاتن: تاڵان‌و برۆ.

[٦] فەریادڕەس: بەکەسێك ئەوترێ بچێ بەدەم هاواری کەسانی ترەوە، ئەم فەریادڕەسەش پارێزگاری ئەو دەمەی سلێمانی خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەعرووف جیاوگ بووە).

# ڕۆژوی پیرەمێرد بۆ زانستی *

ئێمە هێلانە بلبلێکی میللیمان هەبوو! ناوی زانستیبوو، بلبلی خۆشئاوازی وای تیا هەڵکەوت، کە لەگوڵزاری شیعرو ئەدەبدا ئاوازی بەرزیان کێلی زیندوو ئەکردەوە... ڕووخاندیانو ئەوی ڕووخاندیشی ڕووخاو ناویشی زڕا... من دوو ڕۆڵەی نیشتمانم گرتبووە باوەش:

١. ژیان.

٢. زانستی ...

خوا ئەیزانێ چە ڕەنجێکم لەگەڵ زانستی دا، چەندجار شێوانیانو لەپێش چاوی حکوومەتی عێراق بە میقرۆبیان دایە قەڵەم، ڕەنجیان بە بادام، ئەو هەموو پارەیەی کە میللەت دابووی لەگەڵ مۆبیلیاو کتێبخانەو مەکتەبە، کە (صالح زەکی بەگ) بۆی سەندین، ڕۆیی، لەوساوە تا ئێستا شینم بۆ نەکراوە، چەپۆکی زۆردارم بەسەرەوە بووە، ئێستا خوا موتەسەرڕیفێکی ئەدیبی بۆ ناردووم، دەمم کراوەتەوە، شینو زاریمە، ئەمەوێ فائق بێکەسو کوڕگەلی زانستی بە شیعر لە تەکما بگرین(**)

---

* ژین، ٧٣٩، ساڵی ١٧، ١٨ی نیسانی ١٩٤٤.

(**) دوای ئەم بانگەوازەی پیرەمێردی نەمر، تەنها بەرهەمی بەنگینەم بەرچاوکەوتووەو هاواری لێهەستاوە بۆ زانستی.

# شینی عەبدولواحید نووری*

ئەی دڵ وا ڕۆیی مامۆستای دانا
واحد ئەفەندی، خاوەن توانا
لاوان، هاواره، نیشتمان، شینه
بۆ مامۆستای باش دڵ پڕ برینه
دەوران پیاڵەی مەرگی دایە دەس
ئاخی هەڵکێشا بۆ ئاخر نەفەس[1]
زۆر چاوەڕوانبوو وڵات سەرکەوێ
قوتابییەکانی وەك خۆی پێشکەوێ[2]
زۆر حەیفە، زانای هونەر لەدڵبوو
ئاخ، وا بەجوانی میوانی گڵبوو
زۆر تێئەکۆشا بە دڵو بە گیان
بۆ پێشکەوتنی ڕۆڵەی نیشتمان

---

* ژین، ژماره (٧٤٩)، ساڵی ١٨، ١٦ای تەمووزی ١٩٤٤... مامۆستا عەبدولواحید نووری ڕۆشنبیرو نووسەری کورد ١٩٠٣ ــ ١٩٤٤.

(١) ئاخر نەفەس: دوا هەناسە.

(٢) بۆ (کۆ) ئەبێ بوترێ(پێشکەون) بەڵام بۆ کێشی هۆنراوە وای لێهاتووە.

# باوكو كوڕ*

بابە وا جەژنە، خۆ من بێبەرگم
لەبەر بێبەرگی، پێمخۆشە مەرگم
جاران کەوا کەم لە (تاقەی تاق) بوو
جوانو پەسەندی هەموو ئافاق بوو[1]
چەتفەی سورمەی خاس، حەڵەبم ئەسەند
ئێستا وا سەرم ڕووتە، بووم بە پەند،...[2]
ڕۆڵە خەفەتی تۆ منی گریاند
خوا بیگرێ هیتلەر، وا دنیای شێواند
هێجگار بایعی خۆمان خرابن
لەڕاستی میللەت بە جەزبو جابن[3]
بیتاقەی دزراو ئەدۆزنەوە
فەردەی کووتاڵی پێئەقۆزنەوە
قەیناکا، ئێمە ئەوانمان ناسی
ئەوانە کەمتر نەبوون لە نازی

---

* ژین، ژمارە ٧٥٨، ٢١ی ئەیلوولی ١٩٤٤.

[1] تاقە: چەشنە قوماشێکی نایابو جوانبووە، کەواو سەڵتەی لێدروستکراوە .

تاق: تاكو بێوێنە.

[2] چەتفە: پیاوان بەستوویانە بەسەریانەوەو ژنان داویانە بەشانو ملا.     خاس: باشو نایاب.

ئەسەند: ئەکڕی.

[3] بەجەزبو جابن: دەسبڕو خراپن، چاوچنۆکن. بێویژدانن.

# ئەم جەژنە*

خـــالۆ پـــــــــيرەمێرد، خـــــــاوەندەكەی ژیــن
كـــــــورگەلــی زانســــت بۆ جـــــاران ئەگریــن
ســــــــالان تــــــەمثیلت ڕێكئەخســت بۆمـــان
ئێمـــــەش ئـــــــەمانكرد، بـــــە دڵو بـــە گـیان
ڕێگـــــــــەی قــــــومـــــارو دزی بــــڕابـــوو
لـــــــە غــــــەیری خوێندن هیچ ڕێ نەمـابـوو
ئـــــــــەم جـــــەژنە وشكو بـــەبێجلوبــــــەرگ
پـــــیرمەســــوور چۆڵبوو بــــــە گەردی فـەلـەك
خـــــۆ كـورسی كـورسی بــــــــازی نـــــەمابوو
خـــڕنگــــــەی بـــــــــازنــــەی كچگــەل بـــڕابوو
ســــا خوا بەسیبێ ئیــــتر ئـــــــــەم شــــــەڕە
بێبــــــەرگـی دیـــــــــــارە، دەردی هیتلــــــەرە
وابـــــزانـم هیتلـــــــــــــــەر كەوتە ڕاكــــردن
حــــــــەقی خــــــــۆیــــــــەتی بەسنددانمردن[1]
چـــــــــونكە ئـــەوروپای گشت بـــــە كوشـتداوە
ئـــــەڵمانیـش ئیـــــــتر هـــێزی نـــــەمـــاوە...

---

* ژین، ٧٥٩، ٥ی ت١، ١٩٤٤.

[1] سندان: شێرپەنجە، سەرەتان.

# بۆ موفتیی پێنجوین*

لالۆی تووتنچی چوارپایەی پێنجوین
دەمت شیرینکەم بە شانە هەنگوین
موتەسەڕیفی تازە، کاتێ هات
هەندێ کەوتنە ڕێی هات و نەهات
زۆری پێنەچوو لەلامان دەرکەوت
بەسایەی خواوە ڕێی هاتمان بەرکەوت
ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ ژینیا کرد
تەمی دوو دڵیی لەناوا لابرد
ئەووەڵ فەرموودەی وای دەرخستووە
کە بۆ خزمەتی ئێرەی ویستووە
کە ئەو بەڵێنی خزمەتی دابێ
ئەو قەومەش ئەبێ بۆی جانفیدابێ
کەواتە بانگکەین: ئەی مەردی دلێر
چرای خۆمان و ڕووناکیی هەولێر
هەولێرو ئێمە، یەك دڵ، یەکماڵین
ژەنگی ناکۆکی بە گیان ئەماڵین
ڕەسمی گوشادیی کتێبخانەی کرد
هەزار و پێنجسەد کتێب دەستوبرد[1]

---

* ژین، ٧٥٩، ٥ی ت١، ١٩٤٤.

(١) گوشادکرد: فراوانیکرد، زۆریکرد.

بەگیان و بە دڵ تەبەڕوعکرا
زۆر چشتی ترمان کە بۆ ڕێکخرا
ئاخ، خۆزگە کتێبخانەی زانستی
ئەدۆزرایەوە، ئەکەوتە دەستی
ئەو کتێبخانەو مۆبیلیا جوانە
تالانکرا، وەك ماڵی بێگانە
خوا بۆمان ڕێکخا، ئنجا (چیاوك)
بدۆزێتەوە دژ بە جراوك
تووتنچی مژدەتبەمێ، وەك تەموین
ئەوەی ئەگریا، تۆ بووی لە پێنجوین
بە حیکمەت هەمووی زۆرچاك ڕێکخرا
بیناغەی دزی لەناو دەربڕا
ئەو بایعانەی کە هەتا ئێستە
ئەیانخوارد... وتی تۆ هەستە، بەستە!
ئنجا با نۆرەی دەستەی دەستپاکبێ
دەست کەسێ کەوێ بۆ هەژار چاکبێ
تەلیسمی جامی چلکلیل شکا
ئابڕووی پیاوی بێئینساف تکا[2]
تەلسیمێکی وا سەری تیا سڕبوو

---

[2] تەلیسم: ئەفسوون. جامی چلکلیل: لە حەجەوە ئەهێنرێ جامێکە لە زەرد، لە زیو دروستئەکرێ و بەهەرچوار دەوریدا کلیلی ورد چەسپکراون، گوایە چلکلیلن، کە چلەی منداڵ بەسەرچوو پێینەشۆن بۆ ئەوەی سەنگ لەسەر مناڵەکە و دایکی لاچێ.

زۆر زك خاڵیبوو، زۆر کیسە پڕبوو
گوێدرێژ گۆشت و، شێر کای لە بەردەم
قوماش بۆ خۆیان، خەڵك چیتی خەم
مردوو بێکفن، زیندوو ئەتڵەسپۆش
هەژار خوێنی دڵ، تەموینچی مەینۆش
یاخوا تا سەر بێ خۆشی و هیوامان
با (جیاوك) بێ داڵدەو پەنامان

## جەژنی بەنگینە*

ساقی، سا دەخیل، جەژنی قوربانە
تێکە، پیاڵە قوربان قوربانە[1]
دڵ بە شەرابی خوایی سەرخۆشبێ
دەردی گرانی با فەرامۆشبێ
بە مەستی بڵێین (ژین)ی کوردستان
ناوی خۆی دەرکرد لە دەوری جیهان
موطریب تۆش بڵێ بەزمەکەی ژیان
ئارایشیدا تەختی سلێمان[2]
بەستەی نیشتمان بۆ لاوانی ژیر
بەزمی خوسرەوی ئەخاتەوە بیر

---

* ژین، ٧٦٦، ٢٢ی ت٢، ١٩٤٤.

[1] قوربانی دووەم: لە دەورتگەڕێم، لەبەرتمرم.

[2] سەرەڕای تەختی سلێمان پێغەمبەر (د. خ) شاری سلێمانیش ئەگرێتەوە.

سـاقی بـەنەشئەی بادەت یەكدڵم
دوو دڵی ڕۆیی، مەقصوود حاسڵم[٣]
یاخوا قەت ئیتر لێك دوو دڵنەبین
لە شەڕو شۆڕی، یەك بە كوڵنەبین
ساقی ئەم جەژنە ڕوو لە زستانە
شەوی پاییزەو سەهۆڵبەندانە
سەهۆڵ ئاوێنەو خشڵیش گەڵایە
تەمیش تارایەو بووكی تیایە
(بەنگینە) هیوای وایە بە یەزدان
شەڕ ببڕێتەوەو تەسلیمبێ ئەڵمان

[٣] مەقصوود حاسڵم: ئاواتم هاتۆتە دی.

# ژینی خۆشەویست*

ژینی خۆشەویست، چرای ئەم شارە
شەقامی خۆشکرد ڕەئیس ئەمجارە[1]
وا چەوڕێژکرا، بازاڕ، سەروخوار
ڕۆشنایی خستە دڵی ئەهلی شار
ئەووەڵ خزمەتە، تازە کراوە
یاخوا هەر بژی، ماڵی بێ ئاوا[2]
دیسان هەربژی ئەو بیرە بەرزە
خزمەتی وڵاتی وا لەلا فەرزە
سێبەر بەرزبوو، گەیشتە سەربان
ئۆتۆمۆبێلی پیائەڕوا ئاسان
ئەی ژین مژدەبێ، بازاڕ خۆشکرا
خۆزگە سواڵکەری تێدائەبڕا[3]...

* ژین، ٧٦٩، ٢٨ی ك١، ١٩٤٤.

[1] ڕەئیس: سەرۆکی شارەوانی.

[2] ئەووەڵ خزمەتە: باشترین خزمەتە، یەکەمین ڕاژەیە.

[3] ئەم ئاواتەی بەنگینە، تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە، دیاردەی سواڵکردن چارەسەرنەکراوە.

# مەولەوی*

لــــە ڕۆژنــــامەی ژیـــن، لـــە لاپـــەڕە ســــــێ
برووسکەی گـیانـی مەولــــــــــەوی لــــــێدێ
خــــاڵە، فیداتبـــــــم، بــــــاخـــەوانی ژیـــــن
پــــــەیجۆری ئــــــاداب، پێشــــــەوای ئــــایین[(١)]
مــــــژدەت داویـنـــــێ، ڕۆژێ دوای نـــــــــەورۆز
ئـــــــەچنە زیـــــارەت (مـــەولەوی)ی شـــای هۆز
ئێمـــــــەش ئامادەین، بــــــــە دڵو بـــــە گـــیان
هـــــەموو قــــــوتابیی زانســـتیی جــــــــاران
بـــــــە شــــــیعری خــۆش‌و ئـــــاوازی شـــیرین
گڵکـــۆی (مــــــەولەوی)ت بـــۆ ئـەکـــــەین ڕەنگـین
چـــــونکە مـــــــەولەوی بـــــــە نـەشـــیدی جوان
گــــــــەوهەر فرۆشبوو بـــــــۆ گـەلـی کـــــوردان
ئێســــــتا تـــــۆ، کەوا، بـۆ ئــــــــەو بـــە جۆشی
پــــــــەیڕەوی ئـــــــــەوی، ئــــــەدەبفـرۆشـــــی
لـەســـــەر گۆڕەکـــــەی یــــــــــارە ئـــەتـنێژین
بــــــــە دەورتـــــا شـیعری خـــۆت هـــەڵئەڕێژین
ئـــــــــەوە جــــــوانترە لــــە دەخمەی شـــــــایی
دەهـــــــۆڵ‌و زوڕنــــــاو چـــایی هــــەی چـایی[(٢)]

---

* ژین ، ٧٧٢، ٢٥ی ك٢، ١٩٤٥.

(١) پەیجۆری ئاداب: خولیای ئەدەب لەسەردا، مشوورخۆری ئەدەب.

# سوپاسگوزاری*

بەناوی هەموو دڵسۆزانی شار
ئەکەین سپاسی داناو هۆشیار
سپاستانئەکەین محامییەکان
ئەمجارە ژینتان کرد بە چراخان
نیشتمان بۆیە ڕۆڵەی وای ئەوێ
بۆ ڕۆژی تێکچوون بە فریایکەوێ
وتاری جوانتان تەواو شیرینە
بۆ دەوری تاجی وەتەن پەڕژینە
یەزدان زانایی بە ئێوە داوە
با دواکەوتەشبین، کارمان تەواوە
تا ئێستا پیری خاوەند ژینو ژیان
هاواریئەکرد لە لاوی کوردان
خوا ئێوەشی بە وەتەن داوە
بیرپەن تا گیربێ، مایەی هەرماوە[1]
جاران نەزاندوو، وایان دائەنا
ئەیانوت زانست فیتنەی ئەگێڕا[2]

---

[2] دەخمە: مۆر: نیشانە.

* ژین، ٧٧٤، ١٥ی شوباتی ١٩٤٥.

[1] بیرپەن: ئەوەی لە پەندو ئامۆژگاری بیروهۆشی دەستنەکەوێ. تاگیربێ: تا چاوەڕێبێ، تا خۆی بگرێ.

[2] نەزاندوو: نەزانکۆ، نەزانقسە. فیتنە: ئاشوربو پشێوی.

حاشا، زانستی هەر بـــــــــــــــۆ خوێندنبوو
فەخری کـــــــــــــــوردان‌و کوێریی دوشمنبوو
ئـــــــــــــــەو چرای ئێمەش کە کــوژایەوە
فیتنە فوویلێکرد کە نـــــــــــــــەمایەوە
شاگرد، (نـــــــانەوا حاجی بـــــــــــــەنگینە)
وەتـــــــــــــــەنپەروەریی لەلا شیرینە...

# لەگەڵ دڵا*

ئـــــــــــــــەی دڵ، هاوارە، دەمی بەهارە
بـــــــــــــەزمی نەورۆزە، لە گردی یـــــــــارە
بـــــــــــــــۆ یادگاری خاکـــــــــــی کوردستان
جوان جێماوە ئـــــــەو بـــــــــــــۆ نیشتمان
لەگەڵ نــــــــــــــــەورۆزا گوڵ دێتە بەرهەم
بلبل گۆنای گوڵ ئەنێتە نــــــــــــــــاو دەم
هەر بـــــــــــــەو گازەوە مەست‌و ســـــــەرخۆشە
بـــــــــــــەو بۆن‌و عـــــــــــــەترە دڵە بەجۆشە
چـــــــــــــەتری گوڵاڵەی دەشتی شـــــــــارەزوور
لەدوور دیـــــــــارە، وێنەی تـــــــــــارای سوور
ئـــــــــــەو ڕەنگە سوورە لە خـــــــاك دەردێنێ

* ژین، ژمارە ٧٧٦، ١ی ئاداری ١٩٤٥.

نیشـــــــــــتمانپەروەر وا ئـــــــــەگرییێنێ
ئـــــــــەی دڵ، کچگەلی جاف، ڕەشـــــمالْنشین
وەك گــــــوڵ خۆڕەنگن، وا جوان و شــــیرین[1]
ئــــــــەدرەوشێتەوەو گوڵشەن ئــــــــەبینێ
گۆنای خــــــۆی لە گوڵ جوانتر ئــــــــەنوێنێ
ئــــــــەبینی ئەبرۆی تــــــــاقی وەك کەوان
چــــــــــەرخی کێشاوە لە دەوری چـــــاوان
شــــــێوەی بەهاری و هەردی کـــــــوردستان
ئـــــــــەویش شۆخ و شەنگ، پــــــەری نیشتمان
ئنجا پــــــــــەروانەش هەر ئـــــــەو ئەبینێ
بــــــــە شەوقی چرا خۆی ئــــــــــەسووتێنێ
منیش بۆ وەتــــــــــــەن ئەکەومە فــــــوغان
ئـــــــەڵێم هەر بــــــژی کوردو کوردستان...

# جەژنە پیرۆزە*

نــــــــــەورۆزت پیرۆز، یـــــــانەی سەرکەوتن
شـــــــوێنی کوردزبان، مـــــــایەی پێشکەوتن
جـــــــەژنی میللییە نــــــــــــــەورۆزی یاران
شــــــێوەی پەیڕەوی بـــــــــــاو و باپیران

---

[1] خۆڕەنگن: ڕەنگیان سروشتییە.

* ژین، ژمارە ۷۸۰، ۲۰ی ئاذاری ۱۹٤٥.

نـــــــــەورۆزە مایەی ژیـــــــــــن و ژیانمان
مـــــــایەی جـــــــوانیی ڕووی نیشتمانمان
گـــــــــوڵ لە هەموو لا، هەر وەك مــــــەم و زین
دەســــــــتلەملانن، پێکەوە ئـــــــــــــەژین
وەنەوشەی شــــــاخان، وەك پرچی نــــــازدار
ئـــــــــــەدرەوشێتەوە بــــــە بای نەوبەهار،
ئـــــــــــەویش نەورۆزە هــــــــێنایە بەرهەم
عـــــــــەتری وەنەوشە لە دڵ ئــــــــــەبا خەم
دڵێ هـــــــــەزار دڵ، لە خۆشیی گـــــــــوڵزار
بـــــــــە وێنەی عاشق ئـــــــــــەبێ گرفتار،
بـــــــــەڕەزای شاخان چـــــــــەندە جوانە!
بــــــــۆنی، نەورۆزی ڕووی کــــــوردستانە
وەســــــــــــفی گوڵ بکەین نــــــاکرێ تەواو
شـــــــــێوەی گوڵشەنە، لائــــــــەبا زووخاو
نـــــــــەك گوڵ، ئاوازی تـــــــەیری کوردستان
دڵ ئـــــــــەفرێنی وەك نیگای چـــــــاومەستان
نـــــــــــەغمەی بلبل و قاســـــــــپەقاسپی کەو
دنیا ئـــــــەکەنە بــــــــــەزمی کەیخوسرەو
هــــــــەر کەس ئـــــــەیەوێ بێ بۆ نەورۆزمان
خـــــــــۆشییەکەی وایە، نــــــابێ پەشیمان

# پەیڕەوی پەندی پێشینان*

گیانە تـــا ماوی تۆ مەکە تـــوخیان
بـــا، بەخۆڕایی نـــەبی سەرگەردان[(١)]
هـــەتا ئەساسێ نـــەکەی ئامادە
لە ســـاتوسەودای گـــەورەیی لادە[(٢)]
مەڵێ مـــن ئەیخۆم، هەر خۆم بـــە تەنیا
وەك هیتلەر هـــەڵمەتبەری بـــۆ دنیا
هـــات خزمەتبکا، گەڕا بـــە زیان
وا بـــە کوشتیدا قەومی ئـــاڵەمان
ئێوەش لـــە دوای کردەوەی بـــەتاڵ
گۆشتی میللـــەتان زیاتر مـــەکەن تاڵ
ئـــەگەر کردەوەی باشت لـــەدەستدێ
هیچ فـــەرقی مەکە شـــارسان و لادێ
ئـــەگەر تۆ بـــەرزیی وڵاتت ئەوێ
حـــاشا بـــەمجۆرە گەل پێشـــناکەوێ[(٣)]
ئـــەگەر خزمەتتان بـــۆ هەژار ئـــەوێ
بـــە واتەی دزی گـــەل پێشناکەوێ[(٤)]

---

* ژین، ٧٨٧، ٢٤ی مایسی ١٩٤٥.

(١) مەکە توخیان: لە خۆبایی مەبە، لە ڕادە لامەدە. سەرگەردان: وێڵو ڕەنجەڕۆ.

(٢) ئەساس: بنچینە، بناغە. ساتوسەودا: بیروخەیاڵ.

(٣) سەروا دووبارەیە.

ڕاســــــــت و ڕەوانی وەرنە نـــــــــــاو کایە
مەردانە بـــــــــژین ئەگەن بـــــــــە غایە(٥)

عەصرێکە بـــــــــانگی کورد ئـــــــــاشکرایە
لـــــــــە کوێ پێویستی پێچ و پـــــــەنایە!!(٦)

(بـــــــەنگینە) هیوای وایە بـــــــــە یەزدان
چـــــــــرای ئاشکرایی هـــــــــەڵکا نیشتمان

## سەرداری (صیححە)*

ســـــــەرداری (صیححە)، خاوەندی بـــــــەهرە
کردەوەو ڕەنجت بـــــــۆ ئێمە فـــــــەخرە(١)

چـــــــەندێ لەمەوپێش لـــــــــە ژینا نووسرا
کـــــــە خەســـــــــــــتەخانەی منداڵ دانرا

ئـــــــــەم مژدەیە بـــــــۆ چـارەی نەخۆشی
شـــــــارەکەی پڕکرد لـــــــــە کەیف و خۆشی

بـــــــەڵام سەرەتای هێشتا دەرنەکـــــــەوت
کـــــــەوتینە مەراق، دڵمان نـــــــەسرەوت

(٤) سەروا دووبارەیە.

(٥) غایە: ئامانج.

(٦) عەصر: سەردەم، دەوران.

* ژین: ٧٩٩، ١٦ی ئابی ١٩٤٥.

(١) سەرداری چیححە: سەرۆکی تەندروستی.

وتـــــيان نۆ كەســـــــــــيان هەڵبژاردووە
ســــــــەرپەرشتییان پێســــــــــــپاردووە
ڕەنـــــــگە نۆمینەی حـــــــــاجییانبووبن
ئـــــــــەوانیش جارێ بـــــۆ کەعبە چووبن[٢]
بــــــــــەڵکو تا ئـــــــەوان دێنەوە لە حەج
بینـــــــایش بکرێ لـــــــــە چیمەنتۆ و گەچ
ئێمە لـــــــــــــەلامان وایە (جـــــــــیاوك)
بـــــــــۆ هەتیوانمان بووە بــە بـــــــاوك
بـــــــــەڵام ماندوویانکردووە، بـــــــــە تەنیا
پێویســــــــــــتە ئێوەی بکـــــــــــەونە فریا
خـــــــــوا هەموو لاتان بـــــــــە دەستەڵاتکا
نـــــــاحەزتان کـــــــــــزو بێدەستەڵاتکا[٣]

## جەژنە پیرۆزە بۆ ژین*

جـــــــــەژنت پیرۆزبێ ژینی کــــــــــوردستان
ســــــــەربەرزیی کۆمەڵ، هــــــیوای نیشتمان
تـــــــۆی ڕائەسپێری وەتـــەن بـــــــۆ لاوان
ئـــــــــاشتی بنێریت بـــــەدڵ و بـــــــەگیان

[٢] نۆمینەی حاجیان: ڕۆژوویەکە لە وەرزی حەجکردندا ئەگیرێو ماوەکەی نۆ ڕۆژە.

[٣] سەروا: دووبارەیە.

* ژین، ٨٠٢، ٦ی شەیلوولی ١٩٤٥

وەتـــــــــەن لە لاوان جـــــــەژنانەی ئەوێ

ئـــــــاخۆ کەی ڕۆژێ جـــــــەژنیان بەرکەوێ

لاوەکانی کــــــــــــورد، بێنن جـــــــەژنانە

نیشـــــــتمان هیوای بــــــــــەرزی پێتانە

هـــــــــــــیوای وەهایە بـــــــەخوێندەواری

چـــــــــــرایێ هەڵکەن بــــــــــۆ ڕستگاری

ئـــــــارەق و قومار کەڵکێ نـــــــــــــاگرێ

ئـــــــــــــەم دووانە لاوی کـــــوردی پێئەمرێ

حـــــــــەیف نییە هەوڵی چەند ســـاڵەی خوێندن

جـــــــەهل داپپۆشێ، وەك لـــــــێفەی دوژمن!!

(بـــــــەنگینە) هیوای وایە بــــــــــە یەزدان

جــــــــــەژنی پیرۆزبێ هـــــــــەموو کوردستان

# ژینی خۆشەویست*

ژینی خۆشەویست، چرای کوردستان
ڕۆشنایی چاوی وردو درشتمان
ئەمڕۆ کوڕێنیت گەیشتە بیست ساڵ
سەرگۆنای مەردیت بوو بە خەتوخاڵ
پێنجیەکی قەڕنت بەسەردا ڕابورد
سەربەرزیی کوردت بەخۆشی هاورد
شیعرو ئەدەبت خستە کوردستان
ڕۆڕۆت بۆ نەکا دایکی نیشتمان
پیرێکی هوشیار ئاگادارتبوو
ناوی سەربەرزیت بۆ گشت لایە چوو
هەروەك (شانامە) بووی بە یادگار
ناوت ئەمێنێ لەڕووی ڕۆژگار
ژیان، نووسەری دوانزە سوارە
شەڕی مەریوان هەر یادگارە
(ژین)ی نووسەری پەندی پێشینان
هەموو پەندێکت ئەشێ بۆ دەرمان
بوو بەداستان لەناو کورد زبان

---

* ژین، ژمارە ۸۱۹، ۱۷ای شوباتی ۱۹٤٦، ژمارەی تایبەتییە، تەرخانکراوە بۆ یادی دەرچوونی (ژیانو ژین).

چاپخانەی کوردی کەوتۆتە مەیدان
ئەم جەژنە کەوتە دەوری جیاوک
بەڕاستی ئەومان بۆ بوو بە باوک
هیوای وەهایە (بەنگینە)ی هەژار
کە کورد نەیبینێ بێنازی‌و ئازار

## نەورۆز*
## بەبۆنەی ژینەوە

ئەی ژین بەهارو نەورۆزت پیرۆز
بەهاری ژینی، بۆ هۆزی دڵسۆز
بانگکە، بەسەربەست، لەناو نیشتمان
بڵێ، نەورۆزە، جەژنی کورد زبان
ئاگری نەورۆزە، شەوقی ڕووناکە
ڕووناکیئەدا بەم خاکە پاکە
بنووسە جەژنی نەورۆزی خۆمان
بۆ خوێندەوارو نووسەری کوردان
بیدە بەشەماڵ، چاپاری پیران
بۆ کۆهستان‌و تا بەکوردستان(1)

* ژین، ژمارە ٨٢٤، ١١ی نیسانی ١٩٤٦.

(1) پیران: داناو ژیران.کۆهستان: ڕۆژنامەیەکی (کوردی ـ فارسی) بووە، دوکتۆر (ئیسماعیلی ئەردەڵان)لە تاران دەریکردووە. کوردستان مەبەستی ڕۆژنامەی کوردستانە

بڵێ وایاران لەگردی یارە
بەرووی دیارا ئاگریان دیارە[(٢)]
(بەنگینە) ئەڵێ، یاخوا خاوەن ژین
هەر یادگاربێ لەرووی سەرزەمین

## بەهۆی ژینەوە بۆ کۆهستان*

ژینی خۆشەویست ینیاتەکەی پیر
ناڵەی کوردستان، لەجیهاندا ژیر
بنووسە نامەی من بۆ کۆهستان
چیرۆکی تازەی خانی ئەردەڵان[(١)]
گیانی شیرینم، شیرین کۆهستان
لاپەڕەی مەردیت کەوتۆتە مەیدان
دەستنیژی خاسی دانای دەبیران
ڕووناکیی چاوی کوردانی ئێران[(٢)]
خۆشنشینەکەی پایتەختی تاران
دڵسۆزو دانا بۆ گشت کوردستان
هەرلا دەبینم هەر کۆهستانە

---

[(٢)] دیار: وڵات.

* ژین، ژمارە ٨٤٣، ١٧ی ت١، ساڵی ١٩٤٦.

[(١)] خانی ئەردەڵان: خان ئەحمەدخان.

[(٢)] دەبیان: نووسەران.

وا له‌گه‌ڵ ژینا ده‌سه‌ڵانه
ژین له‌کۆششه بۆ قه‌ومی کوردان
هه‌ناسه‌ی پیری ئه‌گاته ئاسمان
خۆ گه‌لاوێژیش له گۆشه‌ی که‌یوان
تاریکیی شه‌وان ئه‌کا به به‌یان
پرشنگئه‌خاته باخ و بۆستان
مژده ئه‌به‌خشێ به‌گشت نیشتمان
ئه‌م سیانه تێکرا ده‌سه‌ڵانن
ڕۆشنایی چاوی خێڵ و گه‌لانن
(به‌نگینه)ش هیوای وایه به یه‌زدان
بژین سێ کوچکه‌ی هه‌موو نیشتمان

## شینی گه‌ڵاڕێزان*

ئه‌ی ژین، وا شینی گه‌ڵاڕێزانه
دڵ که‌یله له خه‌م، وا په‌رێشانه
له‌چاو دێته‌خوار فرمێسکان به‌کوڵ
له بۆ سه‌یرانگای باخی پڕ له گوڵ
شه‌رته تا ئه‌مرم بڵێم هه‌موو جار
چه‌ند له‌لام خۆشبوو نه‌ورۆزه‌که‌ی پار

* ژین، ۸۵۲، ۲٦ی ك۱، ۱۹٤٦.	گه‌ڵاڕێزان: گه‌ڵاوه‌رین.

بووم بــــــــــەهاودەمی بولبولی ســــــــەرچڵ
بــــــــــــەهارم ڕۆیی، نەگەییم بــــــــە دڵ
زۆر هــــــــــــیواداربووم کە چڵ بگــــــریٚ گوڵ
ئــــــــــــــەم چاوەڕێییەم واکــــــەوتە ژێرگڵ
ئــــــــــــــەی هاوار بلبل زســــتانە ئەمجار
ڕۆیی گـــــــــوڵزاری بــــــــــاخی نەوبەهار
هیچ ترسم نــــــــــەبوو لەساردیی زســـــتان
بــــــــــە گەلاٚڕێزان مـــــــن بووم سەرگەردان
هــــــــــــەڵوەری خونچەی گولاٚن بـــــەیەکجار
تــــــــا ماوم ئەڵێم، ئــــــــــاخ!! نەورۆزی پار
شـــــــــــــــەرتە تاماوم ئەڵێم هــــەموو جار
دڵ لای زۆر خۆشـــــــبوو بــــــــەهارەکەی پار
هــــــەرزانیم بـــــــــــــــــەختم ڕوو لە دوایە
وەیشـــــــــوومەی خەزان ئــــــــــەمەی لە دوایە
(بــــــــــەنگینە) شینی بـــــــــــۆ گوڵستانە
هـــــــــاواری لە دەس شوومیی خـــــــەزانە

# ئێشی نەورۆز*

ئەمساڵ لەبەختم نەورۆز ئاڵۆزە
بۆ کەس نانێرم جەژنە پیرۆزە
پیری خاوەن ژین ناکات نەورۆزی
منیش ڕەشپۆشم بۆ زویریی هۆزی
چونکە دڵسۆزە بۆ قەومی کوردان
هەوڵ و کۆششی بوو بۆ نیشتمان
ئەی دڵ دوو ئێشت بەجارێ بۆ بوو
زانستیش نەما، نەورۆزیش تێکچوو
بۆچی وا بووینە ئاردی ناودڕك
ئەولا چقڵەزی ، ئەم لا تووتڕك[1]
ساقی لەم داخە، وا نەوبەهارە
تێکە پیاڵەکەت دڵ خەفەتبارە
لەجێی هەڵپەڕکێ و مامەی گوڵفرۆش
بمدەرێ هەتا ئەکەوم بێهۆش

* ژین، ٨٦٤، ٢٠ی مارتی ١٩٤٧.

(١) ئاردی ناو دڕك: مەبەست پەرشووبڵاوی و لێکدوورکەوتنەوەی کۆڕی یارانە.

چقڵەزی: دڕکەزی، جۆرە دڕکێکی دڕو بە ئازارە.

تووتڕك: جۆرە دارێکی خشۆکی دڕکاوییە، چەشنە توویەکی ڕەش و بەچێژو بەکەڵك ئەگرێ.

ئەم دووجۆرە دڕکانە، بەدەوری باخ و کێڵگەو بێستانا ئەڕوێنرێن و پەرژینێکی زۆر توندو باشن.

# مەرثیە*

ئەی دڵ بناڵە، پاییزە، شینە
گەڵاڕێزانی درەختی ژینە
خاوەندی شیعری پاییزو بەهار
بەجارێ گومبوو، خۆی خستەکەنار
(زێوەر) مامۆستای زانستیی جاران
ئێمەی بەجێهێشت کەوتینە گریان
مانگی چواردە بوو شەوقی شیعری ئەو
وا مانگ پەنایگرت، تاریکداهات شەو
مامۆستای زانای تەنیای نەردم ڕۆ
ساحێب دیوانو خاوەن فەردم ڕۆ(١)
خەزێنەی شیعری وەك گەوهەرم ڕۆ
ئەدیبی کامڵ، بەجەوهەرم ڕۆ(٢)
ئەپاڕێتەوە بەنگینەی هەژار
ئەلحەد سەراکەی بۆ بێ بە گوڵزار(٣)

---

* ژین، ٩٤٤، ٢٥ی ت٣ ، ١٩٤٨. مەرثیە: شیوەن، شین.

(١) تەنیای نەرد: بێهاوتا، بێوێنە

(٢) کامڵ: تەواو.

(٣) ئەلحەد سەرا: گڵکۆ، گۆڕ.

# چەند خۆشە پیربی*

چـــــەند خۆشە پـــــــــیربی و خوێنت گەرمبێ
وەتـــــــــــەنفرۆشی لەلات شـــــــــــــەرمبێ
بـــــــــــۆ خەباتکردن ژیـــــــــــرو چالاکبی
لەنـــــــــــاو لاوانا دیـــــــــــــــــــارو تاکبی
قەسەم بـــــــــــــەگەڵ و خاکی کـــــــوردستان
هـــــــــەر خەباتئەکەم، بـــــــــــەبێپشوودان[1]
قـــــــــــەت ملکەچناکەم لـــــــەڕووی دوشمنان
هـــــــــەتاکو ئەچمە ڕیزی شـــــــــــەهیدان

---

* ئەم هۆنراوەیەك لە كاك نووری بەنگینە وەرگرت، هەروەها بۆیگێڕامەوە، وتی: لەئەنجامی ڕاپەڕینەکانی ساڵی ١٩٤٨ دا، دژی ڕژێمی ئەو سەردەمە، باوکیشم گیرا، کاتێ کە لەبەندیخانە دەرچوو، خزمو ناسیاوان هاتن بۆ لای، هەندێکیشیان سەرزەنشتیانکردو تکایان لێکرد کە واز لە خەبات و خۆپیشاندان بێنێ، چونکە ئەم لەچاو لاوەکانا پیرە و بەرگەی جەزرەبەو ئەشکەنجەو کەلەپچە ناگرێ، لە وەڵامدا، باوکم ئەم هۆنراوەیەی وت.

(1) قەسەم: سوێند.

# نەورۆز*

## - یادی زانستی -

ئـــــــەمساڵ هەرچەندە بـــــــــــەختم ئالۆزە
بــــــــۆ (ژین) ئەنووسم جـــــــەژنە پیرۆزە
ئـــــــــەی ژین ئەم ڕۆژە جـــــــەژنی نەورۆزە
ڕوونــــــاکیی چاوی هـــــــــــــۆزی دڵسۆزە
نـــــــاوی تەئریخی دیــــــــــارە، دیـــــــارە
شـــــــــەوقی ئاگرەکەی سەر گـــــــردی یارە
گڕی ئـــــــــــەو ئاگرە بـــــــــــۆ ئیتتیفاقە
ڕۆژی یـــــــــەکیەتی و بـــــــــەرزیی عێراقە
ئـــــــــــەم جەژنە مژدەی خـــــــۆشیی تێدایە
کـــــــــاتی ژیانەوەی گـــــــــــــــوڵ و گیایە
بـــــــــــەفر نامێنێ لەچـــــــــیاو شاخان
خۆشئەبێ هـــــــــــەردوو بــــــــەری ئێلاخان
بـــــــالندە سەربەست ئـــــــەچن بۆ کوێستان
ئـــــــەڵێن ڕزگاربووین لە دەســـــــتی زستان
وەکـــــــــو ســـــــــەیرانی زانستیی جاران
ئــــــــــەتکرد بە گاڵە، هـــــــەڵپەڕکێی یاران

---

* ژین، ۱۰۰۳، ۲۳ی ئازاری ۱۹۵۰.

ئێستاش دوعامان بـــــــۆ بکەن، بـــــــە دڵ
بـــــــــــرایەتیمان بـــــــۆ ببێ حاسڵ
خـــــــوا بمانخاتە ســـــــــەر ڕێگەی چاکە
لە کەســــــــاسیمان فـــــــــــەلەك بێباکە

## شین بۆ خاوەندی ژین*

خــــــاڵە پیرەمێرد، خـــــــــاوەند ژین و ژیان
مێژوونووســـــــــەکەی ولاّتی کـــــــــوردان
وەك ئـــــــــەمین زەکی و موســـــــتەفا پاشا
تۆش لـــــە قەومییەت هیچ نــــــەتبوو حاشا(١)
دایم یـــــــــەکدڵیی عێراقیت ئـــــــــــەنوان
ئیجتماعیات و پـــــــــەندی پـــــــــیروجوان(٢)
هیممەتی تۆشـــــــبوو زانستیی کـــــــــوردان
هـــــــــەزاران لاوی بــــــــۆ گەل پێگەیان(٣)
زۆرت پێخۆشـــــــبوو ئا بــــــــــەم دیارە،
کردەت بـــــــــەیانە، ســـــــــەرگردی یارە
زۆر تێئەکۆشای تـــــۆ بــــــــــۆ نیشتمان
گیانت بــــــــە بەهەشت شادبێ، شــــــادمان،

---

* ژین، ژمارە ١٠١٨، ٢١ی ئەیلوولی ١٩٥٠.

(١) تۆش وەکو ئەوان، لەبواری خزمەتکردنی گەلی کوردتا کەمتەرخەمیتنەکرد.

(٢) ئیجتماعیات: کۆمەلاّیەتی.

(٣) هیممەت: هەوڵ و کۆشش.

داخی بــــــــەجەرگم، ئـــــــــەی وتار شیرین

ئیـــــــتر کێ هـــاوار بنووسێت لــــــــــە ژین!!

کێبێ بنووسێ پـــــــــەندی پێشــــــــــینان

هـــــــــەموو پەندێکی ئـــــــــەشیا بـــۆ دەرمان

کێ هـــــــــاوار بکات فــــــــــەوتان هەژاران!

کێ تـــــــــــاوانکاران بکـــــــــــاتە گریان![٤]

کێ جـــــــــەژنی نەورۆز بکات بــــــــۆ وڵات!

کێ پــــــــــــــرتەقاڵو گوڵ با بـــــــــە خەڵات

کێ حــــــــــەوت مەنجەڵ چێشت بۆ هەژار بێنێ

دڵی منداڵو گـــــــــەورە نــــــــــــەشکێنێ!!

کێ هــــــــــــاوار بکات شــــــــــــەکر بروێنن

بـــــــــــــۆ عێراق، تـــــــــۆوی چاکە بچێنن![٥]

کێ میعراجنامەو مـــــــــــەولوود بخـــــــــوێنێ

کێ ئــــــــــاثاری کورد وەك قــــــــوو بنوێنێ![٦]

کێ تەمســــــــــــــیل رێکخا نایابو جــــــــــوان

بڵێ گـــــــــەلی کورد بـــــــــەم نەوعە دەژیان!!

ئـــــــــەیفەرموو عــــــــیلمو ئاداب جــــــــوانە

(زانست) چــــــاوێکەو (ژیــــــــــان) دووانە

کێ طەبعیبکـــــــــــات دوازدە ســــــــــــوارە

[٤] شاعیرمان، وریایانە، وشەی (تاوانکار)ی لە (تاوانبار) جیاکردۆتەوە.

[٥] شەکر: قامیشی شەکر.

[٦] قوو: مەلێکی جوانو بێگەردە، پەلێکی زۆر نەرمو نایابی هەیە.

یــــــــادگارێکه بــــــــۆ کورد دیاره
کێی تــــر بنووسێ واتەی مــــــــەمو زین
ئێســــــــتاش عاشقان بــــــــەویادە ئەژین
ئەسەف (بــــــــەنگینە)، مەرگی پــــیرت دی!!
ئاواتی بــــــــەرزی گەلی خۆت نــــــــەدی
پــــــــیرت پیرێبوو، گەوهەر فرۆشی کــــــورد
بــــــــۆ خزمەتکردن، زۆر بـــــە دەستوبرد

## خۆشیی قوتابیی زانستی*

لەدوای شــــــیوەن، خۆشــــــــی بێژراوە
کردەی یــــــــەزدانە، وا دانــــــــــراوە
هــــــــەرچەند لەلایە عــــــــالمێ بمرێ
پێشینان ئــــــــەڵێن عالەمێ ئــــــــەمرێ
بــــــەڵێ، هــــــــەرچەندە ڕاستە، وەهایە
شــــــاعیر نامرێ، لەســــــــەر زارایە
هۆنەر ئــــــــەوەیە دوای ڕاستیکــــــەوێ
ڕێگەی ڕاســــتبگرێو لە کەڵ سەرکــــــەوێ
هــــــەروەك خاوەن ژین بــــــــەڕاستی ژیا
لـــــە دوای مردنی ولآت بــــــۆی گریا

---

* ژین، ژماره ۱۰۲۲، ۲٦ی ت۱، ۱۹۵۰.

ژین تاقانەیە، لەبەر دڵانە
دەستە وەنەوشەی گشت شاعیرانە
کەو لەسەر هەردان بەناڵەی حەزین
خۆشە وەتەنمان، ڕێی ژیان بگرین
لە باخچەی ژیان گوڵ خۆی ئەنوێنێ
بلبل بە نەزمی ژینە ئەخوێنێ
ڕۆژنامەکەی ژین بۆیە بە سۆزە
یادگارێکی پیری دڵسۆزە
(بەنگینە)ش لەبەر چرای زانستی
شاعیریی کردووە بە گوڵی دەستی

## سپاسی کرێکار*

دەمێکبوو نەدەکرا شەقام، خیابان
پارە نەمابوو لای پیرو جوان[١]
بژین ئەوانەی کۆششیان نوان
وا ئیشیان زۆرکرد بۆ گشت هەژاران
لە نرکەی پاچ و لە خشپەی دینار
ڕووناکی کەوتە دڵی کرێکار
ئیتر لەمەولا خۆشدەبێ شەقام

* ژین، ١٠٢٦، ٢٢ە ت٢، ١٩٥٠.

(١) خیابان: شەقام، جادە.

بلبل لەسەر چڵ ئەڵێ سەد مەقام[٢]
وڵات جوانبێ، ئەگەینە مەرام
دەستی یەك بگرین، ببیستین پەیام
لەتەقەی پاچ و (لەخشپەی دینار)
کەوتە گۆرانی لات و کرێکار[٣]
شوێنی تەپوتۆز، جێی کەرو عانە
ئێستا شەقامە، وەرە، بپروانە[٤]
ناوەڕاستی شار، ئەم شوێنە جوانە
ڕێڕەوی گشتی جەنگەڵانمانە
یاخوا هەر بژی پاشای ئەم شارە
ئەم زستانە، وا جەژنی کرێکارە
ئیتر بەرزئەبێ شاری سلێمانی
ناوی لێئەنێن بەغدادی سانی
سەیرانگاکانی ببنە دارستان
لامان خۆشترە لە جەبەل لوبنان
ئاخ، هاوارەکەی، پیر، خاوەن ژیان
ئەکەوتە بەرگوێی گەورەی نەوجەوان
خۆزگە شارەزوور دوا نەکەوتایە
زەرعی شەکرو چای تێدابکرایە

---

[٢] مەقام: ئاواز.

[٣] وشەکانی ناو کەوانەکە لەدێڕی سێیەمیشا، هەن.

[٤] جێی کەرو عانە: ئەو شوێنەی کەری تیا بەستراوەتەوەو عانەیەك لە خاوەنەکەی سەندراوە.

عانە: ئانە: چوار فلسیبوو.

ئەمجا فەلاحیش جەژنی بۆ دەکرا
لەگەڵ کرێکار دەبوو بەبرا
شەعبی عێراقی لەخوایان دەوێ
ئالآیان بەرزبێ و قەومیان سەرکەوێ
(بەنگینە)ش ئەوەی دەوێ لە یەزدان
بژین بە شادی نیشتمانپەروەران

## جوابی نووری باقی بۆ خەنجەر قانع *

نامەی بەنگینە بۆ کاکە خەنجەر
لاوی ئەدیبو داناو پڕ هونەر
نەوەی نیشتمان، ئەی وەتەنپەروەر
عالمو ئەدیب، لاوی بەجەوهەر
گەیشتمە خزمەت ناوی شیرینت
یاخوا بێتەدی ئاواتی ژینت
دیارە بۆ وەتەن جگەرسووتاوی
دیارە وەك یاران تۆش حەقفەوتاوی،
بەڵێ، خزمەتە، بۆ ئێمە فەرزە
کە، لاو تێکۆشا، وەتەنی بەرزە
بەڵام نەك بڵێ چیمە لەوەتەن

* ژین، ژمارە ١٠٣٨، ٢٢ی شوباتی ١٩٥١.

خۆ مـــــــن لاوێکم لە هـــــەردو دەربەن!

کاکە، خـــــەمگینیی هەموان بــــۆ کوردە

چـــــونکە مەڵبەندی کـــورد جێگای گوردە

بمرن ئـــــــەوانەی وەتـــــــەنفرۆشن

بــــــــۆ دواکەوتنی گــــــەل تێئەکۆشن

ئیـــتر هـــــــەربژین دەســــــتەی لاوانمان

هـــــیوای وەتــــــەن و نووری چـــاوانمان[1]

وەتــــــەن ئومێدی دەســــــــتەی لاوانە

هـــــــەرچاوەڕوانی نـــــــــەوەی شێرانە

ئیــــــــتر خوات لەگەڵ بـــــــرای دڵسۆزم

نـــــــــەوەی قانعی دڵســـــــۆزی هۆزم

هـــــــــەم سپاسئەکەم، هـــــــەم چاوەڕوانم

پێبگا عـــــــالەم بـــــــــۆ نیشتمانم

نــــــەك هـــەر جەهالەت یـــــــەخەمانبگرێ

بـــــــــەناحەق لاو و کـــــــوڕگەلمان بمرێ

خـــــــۆ فەخرە مردن وەك دوانزەســــــــوارە

یـــــــــادگارێکە، دائیم دیـــــــــارە

نـــــــاورنیشــــانم ـ نووری بـــــــــەنگینە

قـــــــــەدیم قوتابیی ڕۆژنـــــــــامەی ژینە

---

[1] لەم دێڕەداو لەدێڕی دواتری ئەما وشەی (ئیتر) هەیە، کە نیشانەی کۆتایی‌و تەواوبوونی نامەو بابەتە، لەگەڵ ئەوەشا باس هەر بەردەوامە .

# نەورۆز*

ئــــــــەی ژین هاوارە، کاتی نــــــــەورۆزە
نــــــــەورۆزە جــــــــەژنی هۆزی دڵسۆزە
نەورۆزە، ڕۆژی ئــــــــەووەڵ بــــــــەهارە
جــــــــەژنی کوردانە، خــــــــۆ یادگارە
تــــــــەمی زستانە دەشوات بــــــــە بێخەم
نەورۆز گــــــــوڵ و گیا دێنێتە بــــــــەرهەم
ڕۆژی تــــــــازەیی ئــــــــەووەڵ بــــــــەهارە
خــــــــۆ سەری ســــــــاڵی کوردی هــــــــەژارە
چیمەن فەرشــــەکەی حەوت ڕەنگ ئــــــــەنوێنێ
بلبل بــــــــەسەریا سەربەرز ئــــــــەخوێنێ(1)
پۆڕ بــــــــەکناچە لەچەم ئــــــــەخوێنێ
لەلای نیشــــــــتمان چاك خۆی دەنــــــــوێنێ(2)
سەیریکەن بــــــــەرزیی ڕیشۆڵەی هــــــــەژار
ئــــــــەبێ بە ڕەققاص لە خۆشیی بــــــــەهار(3)
خۆ شــــــــابازگەلی دەشتی مــــــــەریوان
بــــــــەپەرواز ئەڵێن، بژی وەتــــــــەنمان

---

* ژین، ۱۰٤٤، ٥ی نیسانی ۱۹٥۱.

(1) لەم دوو دێڕەدا ، دووجار سەروا دووبارەیە.

(2) لەم دوو دێڕەدا ، دووجار سەروا دووبارەیە.

(3) ڕەققاص: سەماکەر.

کەو لـــــوتکەی نزار ئـــــــــەکا بـــــــەلانە

ئـــــــەڵێ نـــــــەیبیستم دەنگی بێگـــــانە

قـــــــازو قوڵنگی دەشـــــــــتی گــــــەرمیان

بـــــــــە پۆل دێنەوە بــــــــۆ وڵاتی خۆمان

بـــــــــەهارە، ئیتر شـــــــایی شـــــەماڵە

ئیـــــــــــتر دەربەندان شــــــــوێنی ڕەشماڵە

هـــــــــــەموو چڵێکی داری ســــــــــەرچنار

مـــــــەلێ دەنوێنێ لە خۆشـــــــیی گـــــوڵزار

ئـــــــــەمساڵ نـــــــەورۆزی پـــیرەمەگروونە

ســـــــــەهۆڵئاوەکـــــــــەی فێنکیی دەروونە

کارێزی شــــــــەریف ئـــــــەمساڵ خـــــەمگینە

بۆ (پـــــــیرەمێرد) ی وەستای (بــــــەنگینە)[٤]

---

[٤] وەستا: مامۆستا.

# نەورۆز*

ئەی دڵ، وا وەختی جەژنی نەورۆزە
نەورۆز جەژنەکەی هۆزی دڵسۆزە
ڕۆژێکە جەژنی نەوبەهارییە
ڕۆژی خۆشییە و بۆ (ژین) دیارییە
ڕۆژێکە گوڵشەن ئەڕازێتەوە
بولبول لەگەڵ گوڵ ئاشتئەبێتەوە[1]
ڕەنگی زەردی چڵ سوور ئەبێتەوە
باخەوان چاوی ڕوونئەبێتەوە[2]
کەو لەنزاران ئەسووڕێتەوە
هەرداو هەردئەکاو ئەخولێتەوە
بانگئەکا، ئەڵێ، نەورۆز وا هاتم
بەدرێژایی ساڵ بۆت بە ئاواتم
(بەنگینە)ش نەورۆز یاد ئەکاتەوە
یادی پیرەمێرد بیرئەخاتەوە[3]

* ژین، ژمارە ١٠٩٣، ٢٧ی مارتی ١٩٥٢.

(١) سێ جار و لەسەر یەك و بۆ سەروا، وشەی (ئەبێتەوە) بەکارهێنراوە.

(٢) سێ جار و لەسەر یەك و بۆ سەروا، وشەی (ئەبێتەوە) بەکارهێنراوە.

(٣) (بیرئەکاتەوە) نووسرابوو، من پێموایە (بیرئەخاتەوە) بووەو بەهەڵە نووسراوە، واتە هەڵەی چاپە.

# سكالایەك لەگەڵ هەور*

هــــــــەورە سـپییەكەی مــــــــانگی ڕێبەندان
كەوتوویتە بــــــــەینی زەویو ئـــــــــاسمان
ســــــــــەلامت بدەی بـــــــــــە حاڵی هەژار
خۆشـــــــــەویستئەبی لای پـــــــــەروەردگار
كۆمەڵی هــــــــــــەژار، برای كــــــــــرێكار
بـــــا لەدەستی تۆش نـــــــەكەونە هـــــــاوار
دەگـــــــەڕێیت هـــــــەموو چیای كــــوردستان
بـــــــــــڕوانە خاكی گشــــــت زەحمەتكێشان
تــــــۆ تەفرە نەخۆی بـــــــــــە واتەی زستان
نـــــــــەورۆزیان لێدێ، بتخەنـــــــــــە زیندان!

**وەڵامی هەور:**

مــــــــــن هەوری سپی، پـــــــەردەی ئاســـمانم
یـــــــا یاساوڵی ســـــــــــاردیی زســـــتانم[1]
ئـــــــــەبووم بـــــــــەجەللاد ڕێگای كـــەلیخان
گـــــــــــەلیكم كوشتووە لەپـــــــــــیرو جوان
لیكمدایەوە چل شـــــــــــــەوە ژیــــــــــــانم
بـــــــــۆ گەلی هەژار بۆچ بێت زیـــــــــانم!!

---

* ژین، ١١٣٦، ١٢ی شوباتی ١٩٥٣.

[1] یاساوڵ: پاسەوان.

خراپبم، لە چاك ئەبێ بەدەربم
لەناو وڵاتدا هەر شار بەدەربم
ئیتر بەهاردێ، ئەکەومە خەتەر
ئەبم بەهاوڕێی ئەیلوول و سەفەر...

## پاییزو فەلاح*

پایزی خواگرتوو، دوژمنی هەژار
بەرگری فەقیرو هاوڕێی ئیستیعمار
گەڵای دار زەردبوو لە ترسی سەرما
بلبل بێدەنگبوو، ئەو شەوقەی نەما
پاییز سەرمای تۆ پیاو ئەتەزێنێ
وەك ئاغا زوڵمەت بۆ فەلاح دێنێ
بەڵام بەربەستیی ئاغا کراوە
باخەوان گیانی ناوە بەلاوە
دەشتەوان زویر، جەواڵ ئەدڕێنێ
نابێ بێگاریی ئاغا بمێنێ
من تووتن بکەم بەدڵ و بەگیان
بۆ دۆنمەکان بەن بە ئاغاو بە خان!!
ئەو لەناو قەسرا با، بیشەکێنێ
من چلەی هاوین خۆر بمسووتێنێ

* ژین، ژمارە ١١٧٨، ١٧ی ك١ی ١٩٥٣.

خاوەن تووتنبم، بۆ پەکمکەویٚ
دۆنم بەپارەش دەستمنەکەویٚ
لە کام ئایەتدا فەرموویە یەزدان
لەژین بیٚبەشبیٚ هەژاری جیهان

## بۆ ژین*

ژینی خۆشەویست، چرای ئەم شارە
دائیم ئازادبیت، یادت هۆشیارە
ئەی ژین بەنگینە قاچی شکاوە
لە نەخۆشخانە کزو داماوە
ئاشتیخوازیٚکبوو، بیٚوەی، بیٚزیان
چەرخی شەڕفرۆش لوولاقی شکان
(بەنگینە) ئەڵیٚ لام وایە، وایە
ئاخر ڕۆییمنم وا لەڕیٚگایە
ڕیٚگای ئاشتیم گرت لوولاقم شکا(١)
بۆ ڕیٚی شار هەنگاونانیٚمو نەمنا
ئەگەر ڕۆیشتم بۆ گردی سەیوان
ئاشتیخواز ئەمبا بۆ لای شەهیدان

* ژین، ١٢٠٩، ٢٩ی تەموزی ١٩٥٤.

(١) لەو سەردەمەدا بزاڤی ئاشتیخوازی گەلیٚ پەرەیسەندووە، لە خۆپیشاندانی ئاشتیخوازاندا بەنگینە بەر پەلامار کەوتووەو لاقی شکیٚنراوە.

# گیانی شیرینم*

گیانی شیرینم، گۆڤاری هەتاو
بەبوونت شادبووم، ئەی گوڵی گوڵاو
خۆتت نیشاندام، لەشاری هەولێر
بە ڕووناکیی تۆ دڵان ئەبن تێر
هەرچەن لەو باسە تۆزێ لامداوە،
لەترسی زستان جەرگم سووتاوە
ناخۆشیی زستان، پاییز دیارە
هاوینی خۆشی وا لە سێدارە
بەرگی وارانی بەزۆر دادڕی
بولبول لە باخی گوڵان هەڵفڕی[(١)]
زستان غەزەبی لەچاو ئەبارێ
بەرگی هەژاری دڕی بەجارێ
وڵاتی ئێمە ئیمساڵ بێدارە
بۆ دارو خەڵووز لە شار هاوارە
ڕۆژێ هەر دەبێ دەمەو بەهار بێ
زستان لە کردەی خۆشی بێزاربێ

---

* گۆڤاری هەتاو، ژمارە (١٧ ــ ١٨)، ٣١ی ك١، ١٩٥٤.

(١) واران: هەواران.

# ئەی دڵ*

ئەی دڵ، بۆ دایم پڕ لە گریانی
چەرگیش لەگەڵ تۆ بوو بەبریانی
وەك بەندیخانە دیلت تێکراوە
دەرگای ڕووناکیت لێداخراوە
هەرچەندێ دەکەم ناکرێتەوە
بە هیچ هەوڵێك هەر ناگەشێتەوە

**جوابی دڵ:**

تا دڵی تۆ بم هەروا دەکەم شین
نایەتە ناوم خۆشیی سەرزەمین
وا هەموو دنیا لە من گیراوە
من بەخۆڕایی پشتم شکاوە
تاڵم باریکبوو، وەك تاڵی دەزوو
خۆشیی منو تۆ، وا لە دەست دەرچوو
کاتێکم زانی برام، برامەوە
چوومە گۆڕستان نەگەڕامەوە
ئەچمە باخەڵ خاکی نیشتمان
ئەو خاکە جوانەی گردەکەی سەیوان

* ژین، ١٢٣٧، ١٧ی شوباتی ١٩٥٥.

ئـــــــــەی دڵ چۆن بڕۆین هەروا بـــــە ئاسان
چۆن بـــــــــەجێبێڵین گەڵو نیشـــــــــتمان
هیچ کەڵکمان نـــــــەبوو، نـــــــە زۆرو نــە کەم
وا بـــــــەجێدیڵین کـــــــوردستان پڕخەم
بـــــاقی وەســـــسەلام (بـــــــەنگینە)ی هەژار
بـــــــــەرزیی هۆزی ئـــەوێت لە پەروەردگار[1]

## ماتەمی حاجی شێخ نووری*

ئـــــــەی ئەسەف ڕۆیی حاجی شــــێخ نووری
ڕۆیی بــــــــەڕاستی و زۆر بــــــە جەسووری[1]
دەنگی کــــــەفو دەف گــــــــــەیشتە ئاسمان
بـــــانگی (حــەی ئەڵلا) گەیشتە ڕووی جیهان[2]
عـــــــالم و ئـــــــــەدیب، ڕێگای دینم ڕۆ
ناصحی ســــــــــــــەر ڕێی موســـتەقیمم ڕۆ[3]

---

[1] هۆزی ئەوێت: ئەبێ وابووترێ(هۆزیەوێت).

* ئەم هۆنراوەیەم لە بەڕێز مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ جەلالی قەرەداخی وەرگرت.

ماتەم: پرسە. حاجی شێخ نووری (١٨٨٦ ـــ ١٩٥٦) زانایەکی پایەبرزو بەتوانا بووە، کوڕی زانای گەورە شێخ بابا عەلی تەکییەیە(١٨٥٥ ـــ ١٩٤٠).

[1] ئەسەف: بەداخەوە. بەڕاستی و زۆر بەجەسووری: واتە بەڕاستیو چاونەترسی و لەسەر ڕێی ڕاستو دروست ژیاوەو، ترسی ئەو دنیای نەبووە.

[2] کەف: لەپی دەست.

[3] ناصح: ئامۆژگاریکەر:

ماموٚســـــــتای باشی موفتیی گـــــــــەلم ڕۆ
ئیمـــــــامی خۆشڕووی نـــــــاو میحرابم ڕۆ[٤]
ئـــــــــاگر بەربووە دڵی ئـــــــــــەهلی شار
بـــــــــــۆ کۆچی خێری دەمی نـــــــەوبەهار،
بـــــــــــۆ سەر ڕێگای خێر سۆفیانت ئـــــەدوان
وەفاتت فەرموو بـــــــــۆ گردی ســـــــــەیوان[٥]
بووی بـــــــــەمیوانی حاجی شـــــــێخ ئەمین
هەردوو بـــــــۆ ڕێی دین پیـــاو باش و ئـــــەمین
لیوای ســـــــــلێمانی، ناحیەی قــــــــــــەرەداخ
بـــــــــۆ تۆ ئـــــــــەناڵن دەروون پڕ لـــە داخ[٦]
ذیکـــــــــــــری ئێوارەو تەهلیلەی بـــــــــەیان
بـــــــــــــەدەنگی خۆشی تۆ ئـــــەبوو بەیان[٧]
زبـــــــــانت ڕێگای ڕاستیکرد بـــــــــــەیان
ڕێگای خـــــــــــولەفات پێئەدا نیشـــــــــان[٨]
خوا بتبەخشـــــــێ، ماموٚســـــــــتا نووری
فـــــیردەوس یانەتبێ، تۆ بــــــــە ڕەنگسووری[٩]

---

[٤] سەرروای ئەم تاکە لەنگو نارێکە.

[٥] وەفاتت فەرموو: کۆچی دواییتکرد.

[٦] لیوا: لەجیاتی پارێزگای ئێستا بەکارهێنراوە. ناحیە: ناوچە.

[٧] ذیکرو تەهلیلە: یادی خواو پاڕانەوەو لاڵانەوەو نزاکردنی کۆڕی مزگەوتو خانەقاو تەکیە.

[٨] خولەفا: جێنشینەکانی پێغەمبەری مەزنمان(د. خ).

[٩] فیردەوس: بەهەشت.

# باخەوانو گوڵ*

باخەوان ئەڵێ، ئەی گوڵی گوڵزار
وەنەوشەو نێرگز، یارانی ناوشار
ئەمڕۆ بەهارە جێژنی گوڵانە
کۆبوونەوەمان لە خۆشیتانە
هەر گوڵە بۆنی بۆ دانیشتووان
لەبەر جوانیی گەلو نیشتمان

**وەڵامی وەنەوشە:**

وەنەوشەی هەردان شینپۆشی نزار
ملکەچ وەستاوە، دیارەو دیار[1]
ئەڵێ، من گوڵی خاکی کوردانم
لەم خاکە ئەڕوێم، گوڵێکی جوانم
باخەوان، من خۆم هەروا ڕواوم
ئەوا ئەبینی بینایی چاوم[2]
من خەتوخاڵی ڕووی نیشتمانم
کاکۆڵی لوولی خوێندەوارانم
ئەوەی بەعیلم ڕووی خۆی ئەنوێنێ
ناوی هەر فەخرەو دائیم ئەمێنێ

* گۆڤاری هەتاو، ژمارە ٦٠، ٢٠ی نیسانی ١٩٥٦.
(١) واباوە کە ئەوترێ (وەنەوشەی باخان)، چونکە لە باخانا خۆی ئەنوێنێ، نەك لە هەردانا.
(٢) هەروا ڕواوم: خۆڕسکم.

**وەڵامی نێرگس:**

نێرگس بـــــــــەمەبەستی چـــــــاوی کردەوە
بـــــــەو بۆنە خۆشـــــــــە دەمی کردەوە[٣]
ئـــــــــەڵێ، مـــــــن گوڵی کاتی بـــــەهارم
مژدەی نـــــــاوشـــــارو دیاریی یـــــــارم
کام یار! ئـــــــەم یارەی گەل تێکـــــــــەیەنێ
زانســـــــــت لەدڵی وڵات بـــــــــــڕوێنێ
خۆ مـــــــن نێرگسم، لە خـــــــاك دێمەدەر
دەچمە نـــــــــاو پەرداخ بــــــەبۆنی هونەر
خــــــزمەتی جوانیم ئــــــــەخرێتە ســەر سـەر
ئـــــــەبم بــــــەشیعرو دەچمە نـــــاو دەفتەر

**مێخەك:**

بـــــــــاخـــەوان، منیش گوڵێکی جـــــوانم
نــــــــاوم مێخەکە، باشـــــــی ئــــــــەزانم
بـــــــــــۆنم شـــــــــتێکە لەبۆنی جوانان
منیان خـــۆشئەوێ کــــــیژۆڵەی کـــــــوردان
منیش ئــــــــــەوانم تــــــــــەواو خۆشئەوێ
با بـــــــــە عەتری مـــــــن خەویان لێکەوێ
ئێمــــــــــە ملوانکــــــەی کچە کـــــــوردانین
لارو لـــــــــــەرزانەی ڕووی نیشـــــــــتمانین

---

(٣) سەروا دووبارەیە.

# بەهۆی ژینەوە

## بۆ ئەو مامۆستایانەی کە لەکوردستان دووربوون*

مامۆستا ئـــــــەمساڵ وەرنە ســــــولەیمانی
بــــــــــەهەشتی زەمین، ســــــــەیرانگاکانی
هــــــــاوینەهەواری پشتی تـــــــــەوێڵە
بــــــــاخی ئاوێسەر دڵان بـــــــۆی وێڵە
چوار بـــــــــاخی پێنجوین، لەگـــــــەڵ بلکیان
ئـــــــــەڵێی بــــــــەهەشتە لە خاکی کوردان
ســـــــــەیرانگای کۆنی بەبەو کــــــــەریم خان
ســــــــەرچنار، ئــــــەزمڕ بـــەهەشتی جیهان
ئــــــــــەو ئاوە ســــــــاردەی قۆپی قەرەداخ
تەسکینی ئـــــــــــەدا بـــــــــە دڵەی پڕ لە داخ
وەرن بـــــــۆ ســـــــــــەیری، دوور وڵاتەکان
زانـــــــــین دەریخست خۆشـــــــــیی وڵاتمان
خۆ پـــــــــــیرەمەگروون هــــــــاوینەهەوارە
شــــــــەهنشای شاخە، بــــــــەرزیی دیــــــارە
هــــــــــاوین ســـــــــــەهۆڵی دووری کردگار
فێنکی ئـــــــــــەدا بــــــــــە دڵەی خەمبار

* ژین، ۱۳۱۱، ٦ی ئەیلوولی ۱۹٥٦.

بلێن ســـــــەیرانگای گشت خاکی کـــــــوردان
یـــــــەکتاو پەسەندە لەســــــەر ڕووی جیهان[1]

## شینی شێخ مەحموودی نەمر*

ئـــــــــەی دڵ کۆستی وا هـــــــەر نەبینراوە
بـــــــــۆ هەڵناقرچێی بـــــــەدەم جەفاوە،[1]
هـــــــــــــاوار سێبەری نیشـــــــــــتمانم ڕۆ
ســـــــــــــەرداری گەلی کـــــــــوردستان ڕۆ
شـــــــــەڕی دەربەندو بـــــــــــەردە قارەمان
بووە بــــــــــــە مێژوو بـــــــــۆ گەلی کوردان[2]
لەشکر کەشییەکەی ئـــــــــەو ساڵەی پــــــــیران

---

[1] یەکتا: دانسقە، تاك، بێوێنە.

* ئەم هۆنراوەیەم لە کاسێتی کاك نووری بەنگینە وەرگرت، کە لەباوکییەوە بۆی ماوەتەوە. کاك باقی حسین ئەحمەد بەقاڵ کە ئێستا موختاری گەڕەکی گۆیژەیە، لە سلێمانی ــ بە دەنگە زۆر خۆشەکەی و بە شێوەیەکی زۆر دلگیرو جوانو بە ئاوازێکی زۆر نایاب ئەم هۆنراوەیەی چریکاندووەو زۆر بەجۆشو کوڵەوە تۆماریکردووە. شایانی یادکردنەوەیە کە لەهیچ سەرچاوەیەکی چاپکراودا ئەم هۆنراوەیەم بەتەواوی بەرچاو نەکەوتووە، لەم دواییەدا، لە هاوکاریدا ژمارە ٨٦٦ ـ ڕۆژی ٢٠/ ١١/ ١٩٨٦، مامۆستا مەحموود ئەحمەد محەممەد لە وتارێکا دەربارەی بەنگینە (حاجی باقی بەنگینە شاعیرێکی میللی لەبیرکراوە) بەشێك لەم هۆنراوەیەی بڵاوکردبووەوە.

[1] جەفا: دەردو ئازار، سەختڵەتی.

[2] بەردەقارەمان: تاشەبەردێکی گەورەو سەرکەشە، لە جەنگی دەربەندا شێخ مەحموودی نەمر بە برینداری لەبنیا گیراوە و ڕەوانەی هیندستان کراوە، هەر لەوساوە ئەم بەردەش ئەم ناوەی لە خۆیگرتووەو هەروەکو خۆی لە دەربەندی بازیاندا ماوەو تۆماری ڕووداوو یادی سەرفرازییە.

ئەتوت ڕۆستەمەو هاتووە لە سیستان[٣]
با دڵ بناڵێ بە دەم دەردەوە
بەشین و ڕۆڕۆو بەم چەند فەردەوە
هاوار بەندی دڵ بڕا بە جارێ
قەڵای قەومی کورد ڕووخایە خوارێ
سەرداری گەلی خێر نەدیوم ڕۆ
ئازا وەك ڕۆستەم، جوان وەك گیوم ڕۆ[٤]
گریان بەشمانبێ کوردی جیهانی
بێگەورە ماوین لە دنیای فانی
ڕۆژی ئاو باریك هەر یادگارە
وەك چەنە قەلعە لە خەڵکان دیارە[٥]
کوێربم، دلێر بووی بۆ ڕۆژی مەیدان
بەنرکەی مەردی ئێرانت ترسان
گولله لە ڕێتا هێزی نەمابوو!!
حدوود لە ڕێتا هەر نەگیرابوو
داخی بەجەرگم چەرخی هیچ نەزان
خستینیە تەعزیەی سەرداری کوردان،
حافظان جەمبن، بخوێنن قورئان

---

[٣] پیران: گوندێکە سەر بە قەڵای مەریوان. ڕۆستەم: پاڵەوانی شانامەی فیردەوسی.

[٤] گیو: یەکێکە لە پاڵەوانە ناودارەکانی داستانی شانامە.

[٥] ئاوباریك: گوندێکە لای گوندی گل، لە باکووری تووزخورماتووەوە. چەنە قەلعە: ئەو جەنگەیە لە میانەی هێزێکی دەوڵەتانی هاوسوێن و تورکیادا ــ بەسەرکردایەتی مستەفا ئەتاتورك، لە ئەنجاما دەوڵەتانی هاوسوێن خراپ تێکشکان.

ناڵەی دڵگیرتان بگاتە یەزدان[٦]

با بگاتە گوێی مەلائیکەکان

بزانن شینە لەخاکی کوردان

خوشکانی لادێ و دایکانی ناوشار

بگرین، بناڵن بۆ شێخی سالار

جافی کۆچەری شان بنێنە قوڕ

جوابی ناخۆشتان بۆ هات، کتوپڕ

قوتابییان ئیتر هیواتان کێیە

بۆ سەرکەوتنمان کێ چاوەڕێیە؟!

کێ دواکەوتنی کوردان بنووسێ

کێ حاڵی گەلی خۆی جوان بپرسێ؟!

هاوار، گەڵباخی و تیلەکۆی ئێران

کۆستی نوێمان کەوت، وەی بۆ دڵتاڵان[٧]

وڵاتی سنەو قەڵای مەریوان

بە هاوارەوەن، بۆ شێخ ئەگریان

چەمەر چۆپیکەن، بیتوێن و پشدەر

بڵێن سەردار ڕۆی، هەی خاکمان بەسەر

کۆتەڵ بگێڕن بۆ کوردی عێراق

بەڵکو نەمێنێ دوودڵی و نیفاق

---

[٦] حافظان: قورئانخوێنە نابیناکان. جەمبن: کۆببنەوە.

[٧] گەڵباغی و تیلەکۆ: دوو ناوچەن لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، دانیشتوانیشیان هەر بەهەمان ناوەوە ناسراون.

کـــــوردی سووریەو شـــــاری کرماشان

ئێوەش وەك ئێمە کـــــەوتنە قـــــوڕپیێوان،

ڕەئیس عەشـــــایر هـــــەورامی و جـوانڕۆ

بـــــەجاریَ بڵێن، هـــــاوار، گەورە ڕۆ!!

هـــــاوار شـــــەڕەکەی چەمی ناڵپارێز

نـــــاوی ڕۆییبوو تاران، تا تـــــەورێز[٨]

بێتەیارەو تۆپ دوشـــــمنت شـــــکان

لەشکرت فڕان ئـــــەم شانەو ئـــــەو شان[٩]

دەوری کـــــەرکووك و شێخی تـــــاڵەبان

هاتن بـــــۆ پرسە سەرداری کـــــوردان

نـــــەغەدەو پەسویَ، هـــــەتا ئەریوان

بـــــە دڵ ئـــــەیانکرد شیوەن و گریان[١٠]

شوکاك و ســـــابلاَخ، سەقزو بـــــانە

لەهـــــەر چوار لاوە شـــــین و گریانە

مەنگوڕو مامژ هـــــەموو بـــــەیەکجار

بـــــۆ مردنی شـــــێخ کەوتنە هاوار

جێگای نـــــادر شا، بیجاڕو هـــــەوشار

شـــــەرتیانکرد کۆچیان نـــــەچێتە هەوار[١١]

هـــــاوار مردنی نادر بوو بـــــەدوو

---

[٨] ناڵپارێز: کەوتۆتە نێوان سەی سادق و پێنجوێن.

[٩] شانەو شان: لوتکە بەلوتکەی

[١٠] پەسوێ: گوندێکە سەر بەمەهابادە. ئەریوان: بەریڤان ، پایتەختی ئەرمەنستان.

[١١] جێگا: ولات، ناوچە، زێد. هەوار: کورێستان.

قاره‌مانی کـــــــورد له چـــــاومان ونبوو[١٢]
ڕادیۆ بـــــــانگیدا لـــــــــه دۆزه‌غه‌ره
شـــــــێخ وه‌فاتیکرد، بـــۆ کورد خه‌ته‌ره[١٣]
کێ دڵســـــــۆزتبێ نیشـــــــتمانه‌که‌م
وا له چـــــــاو ونبوو قـــــاره‌مانه‌که‌م
جێگای شـــێخ سه‌عید نــــاو کوردی تورکیا
ئـــــه‌ڵێن بـــــه مه‌رگت کورد پشتی شکیا...
بـــــــه‌ڵام دوشمنت مـــــــات‌و زه‌بوونه
ســــــه‌د شوکر یا شـێخ چـــرات زۆر ڕوونه،
ده‌وری کـــــــه‌رکووك‌و شێخی تـــــــاڵه‌بان
پرســـــــه‌یان دانا بــــــــۆ سه‌ردارمان
ئـــــه‌ڵێن، ئاخ نـــــه‌وه‌ی کاك ئه‌حمه‌دمان ڕۆ
فــــه‌له‌ك بـــــــۆ کوردت وا کرد ڕه‌نجه‌ڕۆ!!
شـــــای هـــــه‌موو کوردو کـــوردستانم ڕۆ
ئیـــــــتر کورد بێتۆ چـــــــۆن بکا گفتوگۆ!!
کێ ئـــــــاسکه‌ڕاوی گـــــــه‌رمیان بکا
کێ ســـــــه‌یری چیای کـــــــوردستان بکا
کــــــه‌و له نزاران بـــــــــۆ کێ بخوێنێ
بـــــــــاز، بێنازی تـــــۆ، چۆن بچریکێنێ!!
هـــــــاوار شه‌ڕه‌که‌ی پشتی بـــــــه‌یانان

(١٢) واته شێخ مه‌حموودیش وه‌کو نادرشا بووه.

(١٣) دۆزه‌غه‌وه: گوندێکه که‌وتۆته به‌ینی سنه‌و سه‌قز.

خۆ تۆ سی سواربووی ئەرمەنیت شکان[١٤]

دڵی قەومی کورد بۆوا خەمیگرت

سەرداری کەلی تەمی ڕەشی گرت

دیوەخانەکەت هەر یادگارە

کوتوبخانەکەت هەر بەر قەرارە[١٥]

یا شێخ لە دوای تۆ شینە شادیمان

بۆ ڕۆژی پەنهان تۆ بووی هیوامان

دەوران چراکەت نەکوژێنێتەوە

دوشمنت هێزی نەبووژێتەوە

(بەنگینەو بەقاڵ) با بگرین بەکوڵ

وا شەماڵ بردی بۆنی خونچەو گوڵ[١٦]

(لەتیف) خەم نەخۆی کەچوویتە زیندان

کاری یەزدانەو دێیتەوە ناومان[١٧]

---

(١٤) بەیانان: گوندێکی بچکۆلەیە لە ناوچەی شارباژێڕ.

ئەرمەنی: مەبەست لەتیپی ئەرمەنییە لە سوپای ئەوسای ئینگلیزدا.

(١٥) بەرقەرارە: بەردەوام ماوە، دیارە شێخی ئەمر کتێبخانەیەکی زۆر فراوانی هەبووە.

(١٦) بەقاڵ: باقی حسێن ئەحمەد بەقاڵ، پێش ئەم دێڕە، دێڕێك هەیە، لە کاسێتەکەدا ڕوون نییە.

(١٧) لەتیف: شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموود، لەو سەردەمەدا زیندانبووە، ئەم دوو دێڕەی دوایی هی کاك باقین.

# ناونانی شەقامەکان*

ژینی خۆشەویست، چـــــرای ئـــــــەم شارە
نـــــــاونانی شـــــــەقام فەرزە ئەمجارە[1]

لە ســــــــەرا بەرەو خوار نــــــاوی نراوە
شــــــــــەقامی کاوە، خـــــــاوەنی ناوە

شـــــــــەقامی کەرکووك، بـــــەهەشتی زەوی
نـــــــــاوی لێبنێن جـــــــادەی مەولەوی[2]

لەبەر ســـــــانەوی، هـــــــــەتا سەرقەبران
نـــــــاوی لێبنێن شـــــــەقامی سەیوان[3]

شـــــــــەقامێك ئـــــــەڕوا بـــۆ ماڵە شێخان
خـــــــــوا ناویناوە جــــــادەی کانێسکان[4]

ڕێگای ســــــــــەدەکە، کە جـــــــادەی ناوە
ســــــــابوونکەرانە، قەت نــــــــەگۆڕاوە[5]

---

* ژین، ژمارە ۱۳۵۰، ساڵی ۱۹۵۷.

[1] ئەنجوومەنی شارەوانیی سلێمانی، لەحەفتەنامەی (ژین)دا، ژمـارە (۱۳٤۹)، سـاڵی (۱۹۵۷)، داوای لە جەماوەری سلێمانی کرد، کە ناو هەڵبژێرن بۆ شەقامەکانی شار. ئەوەبوو، لەم ژمارەیەدا، (بەنگینـە) بەدەنگ بانگەوازەکەوە هاتو ئەم هۆنراوە جوانو گونجاوەی پەسەند کرا.

[2] کە ئوتومبیل لە کەرکوکەوە ئەهاتە ناو شارەوە، بەو شەقامەدا ئەڕۆیشت، تا ئەگەیشـتە (گـەراجی قالە)، لەژێر (ئوتێل فەرەح)دا. بۆیە ئەوسا بەو شەقامە ئەگوترا (شەقامی کەرکوك).

[3] سانەوی: دواناوەندی سلێمانی، کە تاقە (سانەوی) بوو، سەرقەبران: گۆڕستانی سەیوان.

[4] ماڵە شێخان: ماڵەکانی نەوەکانی (کاك ئەحمەدی شێخ).

پـــــــــیرەمێرد، نـــــــەمرو دڵی زۆر جوانبوو
مزگرو زبــــــانی ژیانی کـــــــــــوردانبوو
ئـــــــــــەویش لەم شارە بــەشی خۆی ئەوێ
جا نازانم کام شـــــــەقامی بـــــــــەرکەوێ[٦]!

# نەورۆز*

هــــــــەتاو نووسیبووت بـــــــۆ نامەی نەورۆز
پـــــــــیرۆزبێ لێتان، نووســـــــــەری دڵسۆز[١]
نـــــــــەورۆز بــــــــــەخێربێ، سەری ساڵمە
بــــــــــەهاتنی ئـــــــــــەو خۆشیی حاڵمە،
مژدەبێ یـــــــــــاران، وا نـــــــــــــەوبەهارە
ئـــــــــــــاگری نــــــــــــەورۆز کاتی دیارە
گوڵ لە هـــــــەموو لا ســــــــــەر دێنێتە دەر
ئـــــــەڵێ وا هەژار دەرچوو لـــــــــــە خەتەر
نێرگس پێشـــــــــــەنگی هـــــــــــەموو گوڵانە

(٥) بەدرێژایی شەقامی (ئیبراهیم پاشا)، شیوێکی پانوپۆڕ هەڵکەندرابوو، بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی لافـاو. دواتر سەرڕێگیراو، کرا بەو شەقامە.
(٦) ئەو شەقامەی بەرکەوتووە، کە ناوی ئەوی لێنراوە.
* گۆڤاری هەتاو، ژمارە ٩٤، ٢٠ی نیسانی ١٩٥٧.
(١) دیارە، خاوەنی هەتاو، خوالێخۆشبوو، مامۆستا کیوی موکریانی داوای هۆنراوەی لە شاعیر کردووە، بۆ جەژنی نەورۆز.

ئەبێ بە مژدە بۆ نەورۆزانە
گوڵاڵە سوورە، هاوڕێی گەزیزە
ساڵی مانگێکە، جوان و ئازیزە
گوڵ لە هەموو لا شێوەی دیارە
قاسپە قاسپی کەو دیارەو دیارە
باڵای شۆخ و شەنگ لەسەر تەلارە
سەد عاشق هەیە، هەر مەجنوون دیارە
پڕشنگی (هەتاو) لە سەر هەردانە
سپی، وێنەی دوڕ، وا پەرێشانە،
بەهەشتی دووەم لە خاکی کوردان
هاوینە هەواری یەك بە یەك جودان[٢]

## ئازیز بەهارە*

ئازیز بەهارە، کاتی گوڵانە
بۆ دڵگوشایی خەفەتبارانە[١]
بەهار هات، ئیتر جەژنی نەورۆزە
بۆ گەل ئەنووسم جەژنە پیرۆزە
دەخیلە، نێرگس پێشانی گوڵان

---

[٢] یەك بەیەك جودان: هەموو دانسقەو بێهاوتان.

* ژین، ١٣٨٦، ٢٠ی ئازاری ١٩٥٨.

[١] دڵگوشایی: دڵخۆشی، دڵشادی.

لەرزانەی جـــوانی کچانی کـــوردان[٢]

چـــاوت هەڵهێنا، دیارییەکەی نـــاو شار

لـــە دوور دیاری، ئـــەی گوڵی نازدار[٣]

وا ســـەری ســاڵە، مەگرە بـــەهانە

نـــاخۆشی بـــەسیە، وەختی سەیرانە[٤]

شـــنەی شـــەماڵی ســەر کۆسارانە

دەرمـــانی دەردی دڵبیمـــارانە[٥]

یـادی پـــیرەکەی سەر گردی یـــارە

خۆ بـــۆ ئـــەم شارە هەر یادگارە[٦]

وا لاســـایی مەم خستمیە گـــریان

بیریخســـتمەوە زانستیی کـــوردان[٧]

بـــەهار، ئـــەمن پیر، ئـــەتۆ دڵجوان

بـــۆچی بـــەجێمام، لەگەڵی یاران!!

کوانێ مامۆستا واحید نـــەوجەوان!

کوا ئەحمەد حەمدی، فیردەوسیی کـــوردان!!

نەورۆز، جـــەژنە بووی بـــۆ گەلی کوردان

---

[٢] لەرزان: ئەو خشڵ و مووروەی ئافرەتان ئەیاندەن لە لاجانگ و کڵاوزەڕو بەرۆکیان.

پێشانی: پێشەنگ.

[٣] دیارییەکەی ناو شار: ئەو چەپکە نێرگزانەی بەهاران ئەهێنرێن بۆ شار.

[٤] سەری ساڵ: یەکەم ڕۆژی نەورۆز.

[٥] کۆسار: هەردو کێو. بیمار: نەخۆش ، ناساخ.

[٦] پیرەکەی سەر گردی یارە: پیرەمێردی نەمر، لەگردی یارە نێژراوە.

[٧] لاسایی مەم: نواندن و شانۆگەریی (مەم و زین) ، لە ناوەڕاستی سییەکانەوە تا کۆتایی چلەکان، پیرەمێرد گەلێ نواندنی راپەڕاندوون و بەنگینەش دەوری بینیوە.

ئەپرازایتەوە، بووکی نیشتمان
جێی جوانانتبوو کارێزی شەریف
بەگوڵ فەرشئەکرا، شیرین و زەریف[8]
وا دەزانم قەت کوردستان نامرێ
چونکە لاوانی ڕێگای ڕاست ئەگرێ
(بەنگینە) تەمای وایە لای یەزدان
زانین زیادبێ لە خاکی کوردان
تۆ هیواداربی گەلت نامرێ
خواو تێکۆشان پشتت ئەگرێ

## نەورۆز*

ساقی نەوبەهار، وا هاتە بەرهەم
لەدڵا دەرئەچێ ئیتر دەردو خەم
نەورۆزە، ئەمجا چاوتان هەڵێنن
لە کوردستانا خۆتان بنوێنن
نەورۆزە ئەمساڵ، کاتی جەمهووری
کورد قوربانییدا بۆ گوڵی سووری[1]

---

[8] زەریف: جوان.

* ژین، ١٤٣٦، ٢٦ی مارتی ١٩٥٩.

[1] بۆ یەکەمجار، لەژێر ئاڵای کۆماری شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨دا، جەژنی نەورۆزی کورد بە ئازادییەکی فراوان کراوە.

هەورە سپییەکەی مانگی ڕێبەندان
هەرچەندە زوڵمو زۆری خۆت نوان
ئیتر نەورۆزە، هەورەگرمێنێ
سەرما وەك زوڵمی زۆردار ئەفڕێنێ[٢]
هەور ئەگرمێنێ، باران ئەبارێ
تاجی زۆرداری ئەخاتە خوارێ
ئۆخەی نەورۆزە، دڵان شادمان
ئیتر ڕۆژهەڵدێ لە گەلی کوردان
مژدە، بەهار هات، سەرما نامێنێ
(گوڵ) ئەپوێنێ، ئاغا ئەمرێنێ
کوردیش لەخەوی ناخۆش هەڵساوە
بەڵێ ئیستیعمار پشتی شکاوە
خۆشە نەورۆزی ئەم نەوبەهارە
گەلی کورد لەگەڵ عەرەبا یارە
گوڵەسوورەکە هەر یادگارە
چونکە دواڕۆژی کوردیش دیارە
هەرچەند ئیستیعمار تیژ تێئەخوڕێ
ببێ بە زرێپۆش، کاڵەمان نادڕێ
من کوردستانم، کوردستانی جوان
بەرزە ئاوازم، برا عەرەبەکان
یاسای سێ ئێمەی کرد بە شەریکتان

---

[٢] هەورەگرمێنێ: سووککراوەی (هەور ئەگرمێنێ).

هـــــــــەر تۆی سەرۆکمان کاکە (کـــەریم) گیان[٣]

نـــــــــەورۆزە، نــــــــەورۆز خەیمەی هەڵداوە

بـــــــــانگی جەمهووری بـــــــــۆ (کورد) دراوە

گولاڵە ســــــــوورەی چەمو دۆڵو چـــــــــــیا

ئـــــــــــەڵێ هــــەر بژی جەمهووریەت ... با

بولبول ئـــــــــــەخوێنێ لەسەر گـــــــولە باخ

وەرگـــــــیرا خوێنی پێشــــــــــەوای ســـابلاّخ

ســــــــــەربازان سەربەست، ئــــەفسەران سەرگەرم

ئـــــــــــەڵێن بڕووخێ... ی بێشـــــــــــەرم[٤]

---

[٣] یاسای سێ ، لەو بەندەدا هاتووە، کە عێراق بە یەکسانی وڵاتی کوردو عەرەبە.
کەریم، عەبدولکەریم قاسم، سەرکردەی شۆڕشی چواردەی تەمووز.

[٤] ناوی سەرکردەیەکی عەرەبە، زۆر دژی سەرکردایەتیی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز بوو.

## بۆ گیانی خوالێخۆشبوو

# عەباس ئیبراهیم دەروێش *

هـــــــاوڕێی خۆشەویست کاکە عەباس گــــیان

خۆبـــــــــەختکەری ڕێگــــــای کوردستان[١]

هـــــــاوکارمانبووی لەســــــــەر ڕێگای ڕاس

هــــــاوڕێی خۆشەویست، گــــیانە کاک عەباس

کــــــــۆچی خێرت کرد تـــــــۆ لە کوردستان

خــــــــوات لەگەڵ بێت لاوی نیشـــــــــتمان

وا چوویتە بـــــــاخەڵ دایکی دڵســــــــۆزمان

بـــــــۆی بەیانبکە ڕەنجەڕۆی کـــــــــوردان

داخی ســـــــــەرکەوتن بردت بـــــــۆ ژێر خاک

ڕۆڵەی نـــــــــەبەزی ئازادو چـــــــــالاك

ســــــــڵاوت لێبێ گردی شـــــــــەهیدان

یـــــــــانەی لای تـــۆیە هاوڕێ عەباس گیان

خزمەتیئەکرد بـــــــــە دڵو بـــــــــەگیان

بـــــــەو ئیمانەوە چووە گۆڕســــــــــتان

ســــــــەبووری دڵی کـــــــــــەسوکارتبێ

بـــــــــۆ ڕۆژی حەشر خوا یـــــــــارتبێ

---

* ژین، ١٤٧٢، ٤ی ئەیلوولی ١٩٥٩.

[١] لە سەردەمی پاشایەتیدا بۆ یەکەمینجار سەندیکای شۆفێرو فیتەرەکانی لە سلێمانی دامەزراند.

گیانە لە قەبرا هەر ئەڵێی گوردم
ڕۆڵەی نەبەزی وڵاتی کوردم[٢]

## بۆ هاوڕێ کۆچکردووەکەم*

هاوڕێی نەبەزم، کاکە (شێخ ئەنوەر)
کوژراوی چەکی دەمانچەو خەندەر[١]
ڕۆڵەی شیرینی نیشتمانەکەم
قوربانیی ڕێگەی کوردستانەکەم
گەلی کورد هەزار قوربانیداوە
نەخشەی وڵاتی بە خوێن نووسراوە
هەزاری وەك تۆ بڕوا بە کوشتن
کورد هەر نابەزێ، با بمرێ دوژمن
لەشکری دووەمە بۆ ئەم وڵاتە
لە بۆ جەمهووری گیانی خەڵاتە
دوژمن بە مەرگت خۆی خستە خەتەر
خوات لەگەڵبێ، کاکە (شێخ ئەنوەر)

---

(٢) گورد: ئازاو نەبەرد.

* پێشکەوتن، ژمارە ١١٠، ساڵی ١٩٦٠.

(١) شێخ ئەنوەری عەبابەیلێ، لە دەربەندیخان شەهید کراوەو تەرمەکەی براوەتەوە عەبابەیلێ.

## بۆ کۆچی دوایی

# مامۆستا ڕەفیق حیلمی*

ئەی دڵ وا دیسان کوڵی گریانە
بۆ زانایەکی ئەم کورد زبانە
بۆ نووسەرێکی ژیرو بەناوبانگ
کۆچیکرد، دەرچوو، ڕۆژی چواری مانگ[1]
باش تێئەکۆشا لە ڕێی نیشتمان
هەوڵی زۆریدا بۆ حەقی کوردان
کردەوەی هۆزی کرد بە داستان
بۆ خوێندنەوەی هەموو کوردستان
بەپێنووس، بەشەو هەتاکو بەیان
بۆ حەق ئەگەڕا بۆ گەلی کوردان
بەسەرهاتی کورد، کردەی شێخ مەحموو
یاداشتەکانی ببینین چۆنبوو
هاوبیری (واحید) کاکە شێخ سەلام
دەرچوو لە دەستمان، گشت خاوەن کەلام[2]
تەرمی بە نرخت هاتەوە ناومان
کردەت هەمیشە وا لەبەرچاومان

---

* ژین، ژمارە ١٥٥٨، ٥ی ئەیلوولی ١٩٦٠.

[1] ڕۆژی چواری مانگ: لە (٤/٨/١٩٦٠) دا کۆچی دوایی کردووە.

[2] واحید: مامۆستا عبدالواحید نووری. شێخ سەلام: سەلامی شاعیر.

نـــــــاوی وننابێ لــــــــــــەناو هۆزی کورد
بـــــــــــــاش تێئەکوشا، زوو بــــــە دەستوبرد
هــــــــــــیوامان وایە بـــــــــۆ نەوەی (حیلمی)
وەکـــو بــــــــــابیان داگـــــــیرکا عیلمی...

## نرکەی کورد*

نرکـــــــــەی کورد بەرزە لـــــــە هەموو هەردان
لـــــــــــەنزیکو دوور، لـــــــــــەچیای بەرزان
لـــــــــەسایەی ســـــــــــەرۆك كاك عەبدولكەریم
برام عەرەبەو بـــــــــــە کوردی ئـــــــــــەژیم
ڕووناکیی هـــــــــــــەتاو، چریکەی خـــــــەبات
تێکڕا قاو ئـــــــــەکەن لــــــــە هەموو وڵات[1]
لـــــــــــەڕێی کوردستان، کـــــــوردە خەباتکەن
گـــــــــیانی پێشـــــەواو شێخ مەحموود شادکەن
دوو دڵی بــــــــــەستە، ئیــــــــــــتر مەوەستە
خۆت بـــــــــە ڕەوڕەوەی خـــــــەڵکی مەبەستە
لــــــــــەناو گەلانا هەر تـــــــــــــۆ جێماوی
هەر تـــــــــــــۆ بێگیانیو ، وا بــــــــەشخوراوی

---

* گۆڤاری هەتاو، ژمارە ١٨٦، ساڵی ٧، ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٦٠.

[1] هەتاو : مەبەستیشی لە گۆڤاری هەتاوە،

قاونەکەن: هاوارنەکەن، بانگهەڵنەدەن.

گەر ئـــــــەڵێی کوردم، ئـــــــەڵێی کوردستان
تـــــــەرمت خـــــــــەجاڵەت بچێتە خاکمان
(بــــــــــەنگینە) ئـــــــەڵێ بـــە پیریش هاتم
بـــــــــۆ کوردســـــــــــتانم، گـــیانە خەڵاتم

# بەخێرهاتن*

**ئەم شیعرە، شاعیری گەل ــ بەنگینە ــ**
**بەبۆنەی هاتنی کاك (کەمال فوئاد) ەوە، لە ئەوروپاوە بۆ سلێمانی وتوویەتی...**

خۆشهاتن ڕۆڵەی دڵســــــۆزی کـــــــــــوردان
ســــــوپاستانئەکا، دایکی نیشـــــــــــتمان
نــــــــــەك بەخێرهاتن، بــــــــەخێربێنەوە
ئێوەن لــــــــــە هەوڵان بــــــــــۆ ژیاننەوە
ئێوە گــــــــــیانفیدان بــــــــــۆ گەلەکەمان
دەنگـــــــــــتان دلێرە بـــــــــــۆ وڵاتەکەمان
پــــــــــارتی پێشڕەوی ئـــــــــەم کوردستانە
لــــــــــە چوار کوردستان وا لـــــــــەگەڵتانە[1]
ڕۆڵەی نـــــــــەبەردی کوردی نـــــــــەبەزاو
نـــــــــەخشەی کوردستان ئـــــــەخەنە بەرچاو

---

* ژین، ١٥٧٣، ٣ی ت ٢ ، ١٩٦٠.

[1] لەو سەردەمەداو لە کوردستانا، تەنیا دوو حیزب لەمەیدانی نەبەردیو تێکۆشانا، ناویان هەبوو ــ پارتی و شیوعی.

# یادی زانستی*

یادت بەخێربێ زانستیی کوردان
تۆ لە کوردستان جەهلت دەرپەڕان
باخ و گوڵزاری کوردستانەکەم
ڕێنیشاندەری نیشتمانەکەم
فامتدایە دەست هەزاران وەك من
کردمان بە تیر بۆ چاوی دوژمن
هەر ئەو خولیایە کەوتە کوردستان
کەوتەوە یادمان، بابان، کەریم خان
تۆ بوویت کە فەرمووت شا صەلاح کورد بوو
ئالاّ هەڵگری ئیسلامی کورد بوو
یادی سەیران و نەورۆزەکەی تۆ
بەکوردی ئەتوت بۆ پێشێ بڕۆ
یادی لاساییت چۆن ئەچێ لەبیر
کردەی شاعیرت پیرەمێردی ژیر!![١]
شەرتە تا ماوم، زانستیی کوردان
ناچی لە یادم بە زاتی یەزان
باقی وەسسەلام، (بەنگینە)ی هەژار
بەرزیی (گەلی ئەوێ) لە پەروەردگار[٢]

---

* ژین، ١٥٧٩، ٢٦ی ك١، ١٩٦٠.

(١) لاسایی: نواندن.

# جەژنی نەورۆزە*

ئەوا نەورۆزە، جەژنی کوردانە
جەژنە پیرۆزە لە کورد زبانە
نەورۆزە فەرشی زەویی گوڵانە
قاسپە قاسپی کەو لە قەد کێوانە
ڕۆژێک بوو، کاوە زۆر بە ئازایی
هورووژمی بردە سەر تەختی شاهی
میللەتیش ئاڵای ڕاستیی بۆ هەڵکرد
بوو بە یادگار، کاوەی کوردی گورد،
سروەی شەماڵە گوڵ ئەلەرێنێ
بولبول بۆ گوڵی نازدار ئەخوێنێ
مایەی ژیانە ئەم کوردستانە
ڕووناکیی چاومە ئەم نیشتمانە
نەورۆز پیرۆزبێ لە هەموو کوردان
نەک هەر لە کوردان، لە هەموو جیهان

(٢) بۆ کێشی نیوە تاکی دووەم، ئەبێ ناو کەوانەکە بەمچەشنە بخوێنرێتەوە: (گەلیەوێ).

* ژین، ژمارە ١٥٩٩، ١٦ی ئازاری ١٩٦١.

# ئەی گەل یەکیەتی*

ئـــــــەی گەل یەکیەتی، ئـــــەی گەل یەکیەتی
هـــــــەل لەدەستمەدەن، دوژمن پـــــــەکیەتی
دوژمن خـــــــــــەریکی پیلانگـــــــــێڕانە
دەســـــــت هـــــــەڵناگرێت لەم کـــــوردستانە
بـــــــا گەورەو بچووك یـــــەك ڕیز بوەستین
لـــــــــە تێکۆشانا هـــــــیچ ڕانەوەستین،
بـــــــا وەك ڤیەتنام مـــــەردو مـــــەردانە
ڕزگــــــــاریبکەین ئـــــــەم کوردستانە

---

* ژین، ژمارە ١٥٩٩، ١٦ی ئاذاری ١٩٦١.

# وەسیەتی بەنگینە*

ئـــــــاواتی منبوو، ڕزگاریی کـــــــــــوردان
وەسیەت بـــــــۆ ئێوە دەستەی هـــــــاوفەردان
ئـــــــــــەوا من مردم نـــــــــــەگەیمە ئاوات
لاوان لامـــــــــــەدەن لـــــــە کۆڕی خـــــــــەبات
تـــــــا ڕزگار ئـــــــــــەبێ کوردو کوردستان
بـــــــــــەڵکو ساڕێژبێ زامی شـــــــــــەهیدان
هـــــــــــــەرکات ڕزگاربوو کـــــــــوردی قارەمان
مـــــــــــن لە گۆڕیشدا، ئـــــــــــــــەبم شادمان
(بـــــــــــــەنگینە) هیوای وایە بـــــــــــە یەزدان
هـــــــــــــەر ئاوەدانبێ خـــــــــاکی کوردستان

* ژین، ژمارە ١٢٧، ١٣ای ئەیلوولی ١٩٧٣... ئەم هۆنراوەیە لە یەکەمین یادی کۆچکردنی شاعیردا و بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر مەرگیدا بڵاوکراوەتەوە...

# پەیڕەویی پەند*

ئەگەر ئەتەوێ سەر ئێشە نەگری
دەم درێژنەکەی، زبانت بگری
ئەگەر تۆ باشبیت، خراپیت نەوێ
نەوەك هەر ماڵت، خواشت خۆشبوێ
دەوران دەورئەدا، خۆ دنیاش کەچە
ڕەئی خۆت مەدە بە ناکەس بەچە
مەیکە بەیاریی ئاشە تەنوورە
بە واتەی نەزان لە خوێش مەبوورە
پیاوخراپ ئەگەر چێشتی لێبڕێ
هیچ تێنافکرێ و سفرەکە ئەدڕێ
لەگەڵ عالم و زانا هوشیاربی
چلۆن بە باشی تۆ خراپئەبێ!
ڕوو بکەرە یەزدان پەکتناکەوێ
بێگانە بەدەر، قەومی خۆت بوێ
هەوڵبدە، ئەگەر زانینت ئەوێ
با لەمە زیاتر قەومت دواتکەوێ
قسەی بێگانە بیاو بڕۆیە
خۆ هەموو عێراق وەتەنی تۆیە(۱)

---

* لە کاك (نووری بەنگینە) وەرمگرت.

دوو برا ئـــــــەگەر دڵیان یـــــــــەککەوێ
بـــــــــە قسەی نـــــــەزان شانیان نـــانەوێ
پێشینان ئـــــــــەڵێن دوو شـــــــەریك چاكە
مایەی بـــــــــــەرزیبان خـــــــــواى بێباكە

# قسەكردنی بەینی كوڕو كچ*

**كوڕ:**

كچە جـــــــــوانەكەی نـــــازك و نـــــــەرمی
بـــــــۆ كام لا ئــــــەچێت تۆ وا بــــــە شەرمی؟!

**كچ:**

ئـــــــــەگەرچی كچم ئـــــــــەچم بـــــۆ خەبات
ئـــــــــەم تۆزە گیانەم ئەكەم بـــــــــە خەڵات!

**كوڕ:**

كچێ، زۆر جـــــــــوانیت، چیت لێقـــــــەوماوە!
مـــــــن بـــــۆ تۆ شێتم، جەرگم ســـــــووتاوە!

---

(۱) بیا: وەرە .(فارسیە)

* لە دەستنووسی كاك (نووری بەنگینە) وەرمگرت.

کچ:

کـــــــوڕی لاو ئەگەر تـــــــۆ منت ئـــــــەوێ
ببـــــــــە پێشمەرگە، گەلت ســـــــــەرکەوێ
خـــــــۆ منیش وەك تـــــــــۆ ژیانمدەوێ
وەختێ شـــــــوونەکەم گەلم ســـــــــەرکەوێ

کوڕ:

ئـــــــەی کیژی جـوان، خۆ مـــــــن شوکاکم
هـــــــــەر وەك پێشمەرگە ئـــــــازاو چالاکم
ئـــــــــەچمە ولاّتان، زانین ئـــــــــــەخوێنم
تـــــــــۆڵەی شەهیدان لـــــــــە بەد ئەسێنم،
تێئەگـــــــــــــەم خوێنمان بـــــــۆچی ڕژاوە
ئـــــــــاغـــــــــاو دەرەبەگ زۆریان هێناوە

کچ:

نـــــــــەمن شوو ئەکەم، نـــــــە تـۆ ژن بێنە
ئـــــــــــاغـــــــا لەتلەتکە، خـــان بڕووخێنە

کوڕ:

ئـــــــەی کیژ، تـانەی تـــــــۆ کاریتێکردم
خــــــانەچەم، زۆڵنیم، منیش هــــــەر کوردم[1]
شـــــــــــەرتبێ تا تۆڵەی کوردان نـــــــەسێنم

---

[1] خانەچە: وەجاخزادە، خانەدان.

حـــــــــــۆریم بدەنێ ژن هـــــــــەر نــــــەهێنم

کچ:

ئـــــــــەی کوڕ، خوا حافیز، خوات لــــــــەگەڵبێ

گشـــــــت تێکۆشانت بـــــــــۆ تۆڵـــەی گەلبێ

کوڕ:

بــــــــــەخوات ئـــــەسپێرم ، نووری چـــــاوانم

دایکـــــــــــــی دواڕۆژی دەســــــــــتەی لاوانم

لـــــــــە خوا دەخوازم مـــــــن و تـــــۆ نەمرین

هـــــــــــەتا لە سێبەر ئـــــــــــالاّ، یەکدەگرین

# نەورۆز*

ئـــــەوا نەورۆزە، قوربان لـــــە بـــانی
دەســـــتلەملانە بـــــە شـــــادمانی
جـــــەژنە پـــــیرۆزە ئەکەم لـــە یاران
بـــــۆ گەلی کوردی مـــــەردو دلێران
قـــــوربان جـــەژنێکە بـــــۆ یادگاری
لـــــەبەر ئیسماعیل مەڕ هات بـــــە دیاری
سەیری ئـــــەم جەژنە چەندە پـــــیرۆزە!!
قـــــوربان شانبەشان جـــــەژنی نەورۆزە
نـــــەورۆزە، ئـــــەمجار سەرما نـــامێنێ
لە شـــــاخ و هـــــەردان گوڵ ئـــەڕوێنێ
هـــــاژەی بـــــەفراوان، بـــە گوڕ دێتەخوار
دەنگی شمشـــــاڵەو خـــــاڵەی ڕێبوار
لەجێی ســـــەهۆڵ و بـــــەفرەکەی زستان
گوڵ ئـــــەبێ بـــە فەرش بۆ خاکی کوردان،
پێشـــــەنگی گوڵان، گوڵە گـــــەزیزە
ســـــەوزو زەردو سوور چەندە ئـــــازیزە
نێرگس بـــــە مەستی چاوی هـــــەڵدێنێ
وەکو چـــاوی یار خومار ئـــــەنوێنێ(١)

* لە دەستنووسی کاک (نووری بەنگینە) وەرمگرت.

ملكـــــــــەچ وەنەوشە، لەســـــــــــای نزاران
وەك قـــــــــــژی لوولـی نـــــــاسك نـــــــازداران
قوربان بـــــــــــە قوربان بـــــــــــەژن و بالأیە
وەك مـــــــن بـــــــەقوربان خاكی ئـــــــالأیە
نـــــــــەورۆز مژدانەی بـــــــــــەهاری پێیە
هـــەژار بـــــــــۆ فرمان هـــــــــــەر چاوەڕێیە
شـــــــــــەماڵ هات مژدەی بـــــــــــەهاری پێیە
ڕۆژی جـــــــــووتیارە، خۆی ئـــــــــاغا دێیە
بـــــــانگئەکا، كوڕگـــــــــــەل تراكتۆر بێنن
جـــــــــەژنی نـــەورۆزە، خـــــــۆتان بنوێنن
بـــــــاقی، سوپاسی (بـــــــەنگینە)ی هـــەژار
جـــــــــــەژنی (گەلـی ئەویٚ) لـــــە پەروەردگار[2]
ئـــــــــــەم چەند فەردانە تا ماوە ئـــــــــەڵێ
یـــــــــــا خوا كوردستان ڕۆژی تیاهـــــەڵێ[3]

---

[1] خومار: مەست.

[2] باقی: ئیتر... (گەلی ئەویٚ) ، لەبەر كێشی هۆنراوەكەی ئەبێ بەم چەشنە بوترێ: (گەلیەویٚ)

[3] فەرد: هۆنراوە.

# (١)ی ئایار*

ئەی گەل تێکۆشە، جەژنی کرێکارە
فەلاحیش وەك تۆ دڵبریندارە
پشتی ئیستیعمار کێ ئەیشکێنێ
کرێکار جەرگی لەبن دەردێنێ
لەسایەی سەری کرێکارانە
داس و چەکوشیش لەسەر سەرمانە
ئیتر شەڕ ناکرێ، حەقی خۆمانە
قەڵەم ناسوێ، یا هەڵناوەرێ
کرێکار لە کردەی جوان ناتۆرێ
حەقی نەدەنێ ئەوسا مانئەگرێ
بەو مانگرتنە ئیستیعمار ئەمرێ
زوو ئیمانبێنە، زاڵمی زۆردار
بکەوەرە دوای بیری کرێکار
درۆو دەلەسە بۆت سەرناگرێ
جەولانی میللەت ئەژی، نامرێ[١]
کرێکار هەڵیکرد ئالای قەومی چین
ئێمەش وەك ئەوان ئەژین، نامرین
گیانمان بە زنجیر قەت نەلەرزیوە
جەنگەکەی کۆریای شەریفمان دیوە...[٢]

---

* لە کاکە تۆفیق بەنگینەوە ـ کوڕی شاعیر.

(١) جەولان: بزاڤ، ڕاپەڕین.

# کوردی دیموکرات*

کـــــــــوردم پارتی دیموکـــــــــراتم
خـــــــــەباتئەکەم بـــــــــۆ وڵاتم
خــــاوەنی عــــــــەزمو ثەبــــــاتم(۱)
مـــــــــەڕوانە هــــــــــەژارو لاتم
کــــــوردم نــــــەوەی گوردی شــــێرم
دەمێکـــــە بـــــــە دوژمن فـــــــێرم
چـــــــــیای زۆر ســـــەختە ســـــــەنگەرم
دوژمن بـــــــــا، بێ بـــــــــەرامبەرم
ئـــــــــەزانم چۆن ئـــــــــــەیبەزێنم
هـــــەتا ئـــــــەمرێ، ئــــــــــەیمرێنم

---

(۲) ئاماژەیە بە بەشداریی بەرزانییەکان لە جەنگی کۆریادا.

* لە کاکە تۆفیق بەنگینەوە.

(۱) ثەبات: خۆراگرتن.

# بەنگینە و بواری پەخشان

لە گەشتی رۆژنامەی (ژیان ـ ژین)و گۆڤارە کوردییەکانی سەردەمی ژیانی شاعیرمانا، تەنها سێ پارچە پەخشانیم بەرچاوکەوتوون، یەکەمیان لە (ژیان)دا بلاّوکراوەتەوە، (ژمارە(٤٧٧) ڕۆژی ٢ی مایسی ١٩٣٦)، دووەمیان هەر لە (ژیان)دا، (ژمارە ـ ٥٠٧ ـ ڕۆژی ٢١ی ك ١ ـ ١٩٣٦) سێیەمیشیان لە(ژین)دا، (ژمارە ـ ١٥١٨ ـ ڕۆژی ٢١ی مارتی ١٩٦٠) بە سەرباسی (زانستیو، مێژوویو کاوەو نەورۆز)دا، ... کە تیایا زۆرتر یادی پیرەمێردی نەمری کردۆتەوەو باسی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە ئەکات لە پێناوی کردنەوەی ئاگری نەورۆز، جەژنی نەورۆزو خزمەتی قوتابخانەی زانستدا دوچاریانبووە...

بەنگینەی شاعیر، لە پەخشانیشا زمانێکی ڕەوانو بێقۆرتو گرێی هەیە، بەشێوەیەکی سادەو ڕوون مەبەست ئەدا بەدەستەوە... لەم بوارەشا و بۆ نموونەی پەخشانی ڕەوانی، ئەم دوو بابەتەی تۆماردەکەم.

# بۆ ژیان پێشکەشە

ئـەم جـەژنی ڕەمەزانــە تەمسـیلێکی کتوپڕمـان کـرد، ... بـەناوی تەلەبـەکانی زانستییەوە سپاسی ئەو کەسانە ئەکەین کە موافەقـەتیانکرد بـۆ هـاتنی تەمسیلەکە. هەرچەند مەیدانی خۆهەڵکێشان خراپە، ئەمما هێشتا فـەخرە بـۆ وەتەنەکـەمان کـە بەشەوو ڕۆژێـك ڕیوایـەتی پاشـایەکی کۆنمـان کـرد، یـەعنی سـلێمان پاشـا مـەشهوورە لەگەڵ شەریف چەلەبیو کوێخاکانی هەمەوەندا، عـەینی وەزعیـەتی ئـەو وەختـەمان هێنایــە پــێش چـاوی بــرا کوردەکانمــان، ... هەرچــەندە ئێمــە بــۆ پــارەی ناکــەین، خزمەتێکە بۆ وەتەنەکەمانی ئەکەین...

بەڵام ئەسەف بۆ ئەو کەسانە، کە موافەقەتیاننـەکرد بـۆ هـاتنی تەمسیلەکەمان، ئەگەر لۆتییەك مەیموونێك وە یاخود ورچێکی پێبوایە، ئەتوانم بڵێم هـەموو شـاری سـلێمانی ئەهاتنــە سـەیری، خـۆ نـازانن ئێمـە غایـەمان هـیچ نییـە، ئـیللا خزمـەتی زانسـتی نــەبێ... بــە فرسـەتی ئـەزانین هـەموو جـەژنێك تەمسـیلێك بـۆ خۆمـان ئەکەین...

قوتابیی زانست: بەنگینە

# چەند خۆشە ئینسان چاك خۆی بناسێ

حەوت ساڵ لەمەوبەر سەقای بەلەدیە بووم، دائـرەی بـەیطـەریـە تـازە دانرابـوو، بـەڵام کـەس نـەیدەناسـی، بـە دائـرەی کـەرو گامـان ئـەزانی، لـە خانەکـەی (ڕەمـزی ئەفەنـدی) دا بـوون ... ڕۆژێ پێیـانووتم : ئاوەڕشـێنی بەردەرگاکـەمان بکـە .. گـوێم نەدایـە .. شـکاتی مـەحموود ئەفەنـدی، ڕەئیسـی بەلەدیـەی کردبـوو .. دیسـان هـەر نەمکردو ، فیکەم لە مودیری بەیطەرە کێشا!!

ئاخری ڕقیان لێهەلگرتم .. منیش تـا دەهات لـێم زیـاد ئـەکرد ... ڕۆژێ پـۆلیس وڵاخەکانی بردم بۆ دائرەی بەیطەرەو، وڵاخێکی باشیان گلدامـەوە، وتیـان عیللـەتی سارییەتی!! .. کوشتیان!!...

منیش زۆر (متأثر) بووم ، چوار پێنج شاگردیشم هەبوو، بەوە مەغروورببووم...
ڕۆژێکیـان مـودیری بـەیطـەرەمـان دی، تـەمامان بـوو بچـین بـە گـژیا، تومـەز مەئموریان زۆربوو، نەمانتوانی هیچی پێبکەین...

ئنجا وڵاخەکـەمان ئـاوی لـەکانیی ئاسکان دەهێنـا، هەرچـەندە بەوێـدا ئـەڕۆیین، وڵاخێکیـان لێگلئەدایەوەـ تـا مایـە پووچبووم!!... لـە پـاش چـی!! لێکمدایـەوە ئـەو فیکەیـە لـەوم کێشابوو لـە بـەختی خۆمکێشابوو!!... ئنجا لەوساوە عەهدمکردووە بەگـژ لـە خـۆم گـەورەتردا نەچـم، لـەڕووی گـەورەدا هەڵنەگەڕێمـەوە، ئەڵبەتـە بێحیکمەت نییە ئەو گەورەیەو، من بچووك!!...

شاگردی زانست: بەنگینە

## پیشکەشی بەنگینە*

**مەکتەبی ناوەند: (هەژار)**

باخی هیوامان ئاوی وشکیکرد
لەجیاتی عیلم بەری جەهلی گرت
بایەکی هەڵکرد، پیرە ڕەشەبا
ڕەنجی زانستیی هەموو دا بە با
لەسەر باخی کورد تەرزەیە باری
ئەو بەرەی گرتی، هەمووی هەڵوەری
هەورێکی نەگبەت ڕۆژی داپۆشی
هەورە تریشقە و لافاوی جۆشی
دڵمانی خۆشکرد، وتمان بارانە
ئینجا سەرەتای گۆپەی دارانە
بە عەکسی پێویست وەیشوومەی نواند
گەڵای دارانی هەموو هەڵوەراند
لەوساوە دائیم تۆو دائەچێنین
بەڵام خێراتی هیچ لێنابینین
ئەمساڵ بۆ ئەو ساڵ خۆمان ڕائەگرین
ئەڵێین بەشکێکم وەك گەلان بژین
بەبرژۆڵی چاو ناو باخ ئەماڵین

---

* ژین، ٧٤٤، ٨ی حوزەیرانی ١٩٤٤ ... روونەکراوەتەوە کام هەژارە.

لە شوێن بەرێکی نەمام هەودالین
پۆل پۆل بە تاقم ئەچینە سەحرا
بۆ بارانبارین ڕووئەکەینە خوا
نەوەك بەختمان یارییەنەدا
ئەمجارەش گەردوون ڕەنجەڕۆمانکا[١]
بەینێکە باخمان ڕەونەقی جوانە
خوایە پێبگا بۆ ئەم کوردانە،...
لەسەر پێویستی (بەنگینە) ناوێ
ئەم هەڵبەستەیە ئینکاری ناوێ
بە گفتوگۆیەك منی مەجبوورکرد
هەرچییەکم پێبوو، نووسیم دەستوبرد
کاشکی هەموو کورد وەك تۆ بوونایە
دەمێکبوو قەوممان ئەگەییە پایە
تۆ هەڵکەوتێکی لەناو بازاڕا
سووتاوی بۆ کورد، نەوەك بۆ پارە
لێت کۆمەڵئەبن وەستاو منالان
تێیانگەیەنە کەساسیی قەومیان
بژی (بەنگینە) بۆ خزمەتی کورد
هەڵبەستەکانت گوێمانی پڕ کرد
تۆ لەگەڵ (هەژار) ببنە نموونە
داخی دڵی خۆت ئەوسا بنوێنە

---

(١) یارییە نەدا: یاریدەنەدا.

(هـــــــــەژار) بێوچان ڕووئـــــــــــەکاتە خوا
بـــــــــــەشکم لەبەری بـــــــــاخی کورد بخوا

## چیت پێشکەشبکەم*

چـــــیت پێشکەشبکەم، بـــــــاوکی بـــــــەڕێزم
ڕۆشـــــــنیی چاوو، تـــــــواناو هـــــــێزم!
کـــــــــۆچی دوایی تـــــــۆ ســـــەرسامیکردووم
بـــــــــــەجارێ هۆش‌و ئـــــــــــارامی بردووم
مـــــــاڵئاواییت خواست، نـــــــا بـــــەدڵ، ناکاو
بـــــــــۆ گیانی پاکت هـــــــەزاران ســــــڵاو...
ویردی زوبانت کـــــــــــــــوردو کـــــــــوردستان
گیانت بـــــــــــــــە بەهەشت شادبێ، شادمان...

* ژین ، ژماره ۹۱، ۲۱ی ت۱ی ۱۹۷۲، ... ئەم هۆنراوەیە هی ـــ نـووری بەنگینەیـە، بەبۆنـەی چـلەی باوکییەوە نووسیویەتی.

# (( بەسەرکردنەوە ))

لێرەدا ئەبێ ڕەنجی کاکە (خەبات تۆفیق بەنگینە) لە یاد نەکەم، کە لە ساڵی (٢٠٠٣) دا، ئەرکی یەکەمین چاپی، بەتیراژی (٣٠٠) دانە گرتە ئەستۆو دیوانەکەی بابەگەورەی ڕووناکیی بینی.

بۆ دووەمین چاپیش، کاکە (ڕێبوار تۆفیق بەنگینە)، پتر قۆڵی لێهەڵکردو، بەشێوەیەکی فراوانترو چاپی باشتر ئەم دیوانە کەوتە بەردیدەی شەیدایانی وشەی گەشاوەی کوردی. بریا، وەچە مشوورخۆرەکانی شوێنەواری بابو باپیران، چاویان لەم دووبرا دڵسۆزانە بکردایەو بەرهەمەکانیان بخستایەتە کتێبخانەی کوردییەوە، ڕەوانی مەزنەکان شادو، چاوی خوێنەران ڕوونبکەنەوە. ئەخوازم ڕۆڵەی پێزانو ئەمەکدارمان لەزیادبوونابن.

# سوپاسنامە

**بۆ مامۆستای بەڕێز کاك عوسمان هەورامی**

**ڕۆژباش ...**

مامۆستای بەڕێز، لەناخی دڵمەوە زۆر سوپاسی هەستی پیرۆزتان ئەکەم بۆ ئەو هەموو ئەرکەی کە خستتە ئەستۆی خۆت و بەوپەڕی لێهاتوویی و دڵسۆزییەوە، چاکی دڵسۆزیت لێهەڵکردو بەوپەڕی چالاکییەوە، کون و قوژبنی کتێبخانەکانت پشکنی، هەتا جوامێرانە توانیت شیعرەکانی باوکم (بەنگینە) کۆبکەیتەوە، هەتا ئامادەکردنی بۆ چاپ.

منیش بەناوی خانەوادەی بەنگینەوە زۆر سوپاسی هەستی نیشتمانپەروەریتان ئەکەم. دیارە ئەو ئەرکە گرنگە، کە خزمەتە بە ئەدەب و ئەدەبیاتی کوردی بەگشتی و خزمەتە بۆ شاعیرێکی هەژاری وەکو بەنگینە، کە بەڕێزتان بوونە هۆی کۆکردنەوەی شیعرەکانی.

ئیتر داوا لە یەزدانی گەورە ئەکەم کە هەرگیز ناخۆشی نەیەتە ڕێگات. هەربژیت بۆ خزمەتی ئەدەب و ئەدەبیاتی گەلەکەمان.

*برات/ نووری بەنگینە*

١/ ٩/ ١٩٨٧

# پێزانین

**مامۆستای بەڕێز کاک عوسمان هەورامی**

**سڵاوێکی گەرم**

ئەوی لەدووتوویێی ئەم کتێبەدایە بەرهەمی هەوڵو گەڕانو خەمخۆری و کۆششو ماندووبوونی ئێوەی بەڕێزە، کە بەڕاستی توانیوتانە سەرکەوتووانە بەرهەمە شیعرییەکانی (بەنگینە) لێرەو لەوێ کۆبکەنەوەو لە دیوانێکی ناوازەدا پێشکەش بەکتێبخانەی کوردی و خوێنەری ئازیزی بکەن، گومانی تیا نیە هەوڵی بەڕێزتان بۆ هێنانەدی ئەم دیوانە بەشێوەیەکی ڕاستو دروست بەدیهێنانی ئاواتی گەورەی بنەماڵەی (بەنگینە)یەو ڕۆحی ئەم شاعیرەش ئاسوودە دەکات، هەوڵو ماندوبوونی ئێوە سەرلەنوێ بانگەوازێکە بۆ نوێکردنەوەی ڕۆحی شۆڕشگێڕیەتیو بوژاندنەوەی گیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بۆ نەوەی نوێ.. ئێمە پڕ بەدڵ سوپاسگوزارین بۆ هەوڵو ماندوبوونتانو دەستخۆشیتان لێئەکەین و نموونەتان زۆر بێت، هەروەها سوپاسو پێزانینمان بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە هاوکاربوون لە دووبارە بە چاپگەیاندنی ئەم دیوانە.

لەگەڵ ڕێزمدا...

ڕێبوار تۆفیق بەنگینە

کوڕەزای (بەنگینە)ی شاعیر

٢٠١٦/٩/٢٤



(بەنگینە) لە چلەی (بێخود)ی شاعیردا



ئاهەنگی نەورۆز



ئاهەنگی نەورۆز: بەنگینە ــ نەجمەدین مەلا



ئاهەنگی نەورۆز: هونەرمەند قادر حاجی حسێن



بەنگینە چەند مانگێك
بەر لە کۆچی دوایی



بەنگینە لەکاتی
خۆپیشاندندا



«بسكينه» و «قلنج» ى شاعير



کۆڕێك بەم ناونیشانە:
(حاجی باقی بەنگینە ــ شاعیری میللی و کورد پەروەر)
پێشکەشکەر: عوسمان محەممەد هەورامی
کۆڕگێڕ: دڵشاد عومەر کاکی
هۆڵی جەماوەر ــ سلێمانی ــ ٨/ ١٢ / ١٩٨٨



وێنەیەکی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی



خۆپیشاندان لەبەردەمی خانەقا



وێنەی ناوبازاڕ نزیک شەقامی مەولەوی



بەرخانەقا لەو سەردەمەدا



یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری سلێمانی لەو سەردەمەدا



یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری سلێمانی لەو سەردەمەدا

# سەرچاوەکان

١ ـ ژمارەکانی حەفتەنامەی ژیان و ژین.

٢ ـ ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژ..

٣ ـ دەستنووسی مامۆستا مەحموود ئەحمەد محەممەد.

٤ ـ ژمارەکانی گۆڤاری ڕۆژی نوێ ...

٥ ـ ژمارەکانی گۆڤاری هەتاو ...

٦ ـ پیرەمێردی نەمر، نووسینی مامۆستا محەممەد ڕەسووڵ هاوار.

٧ ـ دیوانی گۆران، ئامادەکردنی: مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم.

٨ ـ مامۆستا شێخ محەممەدی شێخ جەلالی قەرەداخی، مامۆستا محەممەد ساڵح دیلان، کاک نووری بەنگینەو کاک تۆفیق بەنگینەی برای .

# بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١. شاهۆ، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ١٩٧٠.

٢. دیوانی صەیدیی هەورامی، سلێمانی ، ١٩٧٠.

٣. دیوانی وەلی دێوانە، بەغداد ، ١٩٧٦.

٤ ـ دیوانی سەودایی، شێخ ئیسماعیلی دۆلان، بەغداد، ١٩٩٤، پاش مانەوەی بۆ ماوەی نۆ ساڵ، لە دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی، بە داخەوە بە شێواندنێکی زۆرەوە، بە بێئاگاداریم لە چاپدرابوو.

٥ـ کەشکۆلی حاجی مەحموودی یارەویس، سلێمانی ، ١٩٩٨.

٦ ـ خونچە گوڵ، هۆنراوەی پەروەردەیی، چاپی یەکەم ـ ٢٠٠٠، چاپی دووەم ـ ٢٠٠٨، سلێمانی.

٧ ـ منالو گوڵ، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠٠١.

٨ ـ دیوانی حاجی باقی بەنگینە،یەکەمین چاپ، سلێمانی، ٢٠٠٣. دووەمین چاپ، سلێمانی، ٢٠١٦.

٩ ـ مافە گەشەکانم، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٠ ـ جیهانە جوانەکەمان، ئۆپەرێتو شانۆگەریی جیهانی منالان، هەولێر، ٢٠٠٤.

١١ ـ چاوانی باوان، هۆنراوەی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٤.

١٢ ـ شنەی شادی، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٣ ـ هەشتەمین دانا، چیرۆك بۆ مندالان، لەعەرەبییەوە کردوویەتی بەکوردی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٤ ـ مافی مرۆڤ، بۆ پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی، لەگەڵ لیژنەیەکدا، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٥ ـ لایلایەی دایکانی کورد، لەگەڵ هاشمی سەلیمیدا، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٦ ـ کوردستان و تورکمان، لەعەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی، چاپی یەکەم ـ کەرکوک ـ ٢٠٠٧، چاپی دووەم ـ هەولێر ـ ٢٠٠٨.

١٧ ـ لالەزار، هۆنراوەی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٨ ـ گوڵبژێرێك، هۆنراوەی پەروەردەیی بۆ باخچەکانی ساوایان، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٩ ـ گوڵزاری پەروەردە، هۆنراوەی هەڵبژاردە، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٢٠ ـ ئاسۆی گەش، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٢١ ـ ڕۆشنایی، هۆنراوەی پەروەردەیی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٢٢ ـ گەشە، هۆنراوەی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٣ ـ فەرهەنگی تەقی، کوردی ـ کوردی، لەگەڵ لیژنەیەکدا، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٢٤ ـ چریکە، هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠١٠.

٢٥ ـ باخەوانی جوان، هۆنراوەی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠١٢.

٢٦ ـ کڵپەی بابەگڕ، ئۆپەرێت و هۆنراوەی پەروەردەیی، سلێمانی، ٢٠١٢.

## پێداچوونەوە:

١ـ دیوانی موفتیی پێنجوێنی، هەولێر، ١٩٩٠.

٢ ـ کوردستان، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، لەگەڵ د. مستەفا زەنگەنە، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٣ ـ دیوانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم ـ سلێمانی ـ ٢٠٠٠، بەرگی دووەم و سێیەم ـ سلێمانی ـ ٢٠٠١.

٤ ـ هەردەوان، چیرۆکی مێژوویی، کوردەواری، ٢٠٠٣.

٥ ـ الشيخ عبدالرحمن الطالباني، الجزء الاول ـ سليمانية ـ ٢٠٠٣ـ الجزء الثاني ـ سليمانية ـ ٢٠٠٤، الجزء الثالث ـ سليمانية ـ ٢٠٠٥.

٦ ـ سێگۆشەی بەرمۆدا، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٧ ـ پاژنەی ئاسنین ، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٨ ـ کوێرەوەری، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٩ ـ مراحل تطور الحركة القومية الكردية ـ المجلد الثاني ، سليمانية، ٢٠١١.

١٠ ــ التحـول الـتقني في اعمـال الفنـان ريبـوار سـعيد، رسـالة ماجسـتير، سليمانية، ٢٠١١.

١١ ـ دیوانی چروسنانی، لەگەڵ ئەحمەد چروسنانیدا، سلێمانی، ٢٠١٢.

١٢ ـ گوڵزاری باخچەکان، سلێمانی، ٢٠١٣.

## داڕشتنەوە:

١ ـ بیرەوەرییەکانی تەیمووری لەنگ، سلێمانی، ١٩٩٨.

٢ ـ دبلۆماسیەتی کورد بە درێژایی مێژوو، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٣ ـ ڕیفراندۆم، باشترین شێوازی خەباتە، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٤ ـ بۆقی گەشتیار، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٥ ـ مێروولەیەکی میهرەبان، ٢٠١٣.

## هاوکاری:

١ـ چەند لایەنێکی ڕستەسازیی زاری هەورامی، نامەی دوکتۆرای د. فەرەیدوون عەبـدول بەرزنجـەیی، داڕشـتنی وشـەو ڕسـتەکانی بەشـە هەورامییەکـەی، سلێمانی، ١٩٩٨.

٢ ـ ئەركی ئەدڤێربڵ لە فراوانكردنی فرمێزی كاریدا، ماستەرنامەی ئازاد ئەحمەد حسێن، دارشتنی وشەو رستەكانی بەشی هەوراميیەكەی، سلێمانی، ٢٠٠١.

٣ ـ پیرەمێردو پیاچوونەوەیەكی نوێ، دوویەرگ، ساخكردنەوەو كاریگەریی هۆنراوەكانی شێوەزاری هەورامی، هەولێر، ٢٠٠١.

٤ ـ مۆرفیمە لێكسیكی و رێزمانییەكان و ئەركیان لە شێوەزاری هەورامیدا، ماستەرنامەی، شێركۆ حەمە ئەمین قادر، دارشتنی وشەو رستەكانی بەشە هەوراميیەكەی، ٢٠٠٢.

٥ ـــ سەرپەرشتیی زمـــان و رێنووســـی ئــەم كتێبانـــەی نەهێشــتنی نەخوێنــدەواری، (ئــەلفبێ، زانســتەكانی قۆنــاخی یەكــەم، ســلێمانی، ٢٠٠٢، زانستەكانی قۆناخی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٦ ـــ زایەڵــەی زرێبــار، بەرهەمــە بڵاونــەكراوەكانی قــانع، پیاچـــوونەوەو دارشتنەوە، سنە، ٢٠٠٣.

# Dîwanî Bengîne
## 1908 - 1972



ئەوا من مـــردم، نەگەیمـە ئاوات
لاوان لامەدەن لە کوڕی خـــەبات
(بەنگینە) هیوای وایە بەیەزدان
هەر ئاوەدانبێ خاکی کوردستان

Kokirdinewe w Amadekirdinî
Usman M. Hewramî

چاپخانەی ڕۆشنبیری

٤٠٠٠ دینار